# ئەکسیۆن ئێستی

AXION ESTI

ئیلیتیس ئۆدیسیوس

وەرگێڕانی: د. ئەحمەدی مەلا



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوكەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com



PDF 4 KURD

# ئەکسیۆن ئێستی

AXION ESTI

ئیلیتیس ئۆدیسیوس

وەرگێڕانی: د. ئەحمەدی مەلا



ناوی کتێب: ئەکسیۆن ئێستی
دانانی: ئیلیتیس ئۆدیسیوس
وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: د. ئەحمەدی مەلا
ناونیشانی ئەسڵی:
Titre original: TO AXION ESTI
© Odiysseus Elytis, 1951.
© Éditions Gallimard, 1987, pour la traduction française et l’introduction.
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ١٧٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: فۆنتانا لوئیۆ، چمکی فەزا، ١٩٦٠ مۆزەخانەی نیشتیمانی بۆ هونەری هاوچەرخ، پاریس
دەرهێنانی بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
پیت لێدان: عەزیز عەبدولخالق
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاورەحمان مەحمود
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر– ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٩٠)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

## پێشەکی بۆ چاپی کوردی

ئەکسیۆن ئێستی لە ساڵی ١٩٨٧ لە تەرجەمەی خاڤییە بۆرد و ڕۆبێر لۆنگڤیل بەزمانی فەرەنسی لە دەزگای گالیمار بڵاو بووەوە. هەر هەمان ساڵ دەستم بەوەرگێڕانی کرد بۆ زمانی کوردی. نووسینی یەکەمی چەند مانگێکی خایاند. ئیتر بەبێ ئەوەی پاکنووسی بکەم، لە یەکێ لە چەکمەجەکان بەبێ ناز بۆ ماوەی ١٦ ساڵ خەوی لێکەوت. دوو ساڵ لە ژنێڤ مایەوە و یانزە ساڵیش لە فەرەنسا هەر لەگەڵما بوو، پاشان بۆ ماوەی سێ ساڵ لە ئیسپانیا لە نێو شرە کاغەزی بێکەڵک و مسوەدەی جۆراوجۆری هەڵگەچراودا وەکو خشۆکێکی سڕ بوو، کەوتەوە ژێر دەستم.

ئیتر لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٢ جارێکی تر دەستم کردە تەرجەمە کردنەوەی و لەگەڵ دەقەکەی ئەوکات بەراوردم کرد؛ بەکورتی جارێکی دی سەرلەنوێ نووسیمەوە.

نامەوێ لێرە لەمەڕ ئەم قەسیدە- کاتێدراڵە شتێکی ئەوتۆ بڵێم، چونکە پێشەکییەکەی خاڤییە بۆرد زۆر بە وردی و لێزانانە زۆر کەلێنی لە ساخوتمانی ئەم دەقە ڕۆشنکردۆتەوە، بەڵام ناساندنی بینای دەقی شیعری بەکوردزمان کارێکی زۆر پێویست دەزانم.

ئەم دەقە دەقێکە تاکو بڵێی پڕ گرێ و ڕەمز و هێمای هەمەچەشنە: ئاماژە بۆ میتۆلۆژیای یۆنانی دەکات، لە چمکە مەعریفییە جوداوازەکان توێشووی خۆی وەدەست دێنێ، جا چ یۆنانی بێت چ سەر بەعیرفانی ڕۆژهەڵاتی، چ ئاوردانەوەیەک بێت لە سوریالیەتی سەرەتای سەدەی بیستەم. هەر بەدرەختێک دەکات کە هەزار و یەک چڵە ڕەگی لێ جودابێتەوە و هەر چڵێکیش لە تەڕاییەک خۆراک بگەیەنێتە لق و پۆپەکانی؛ بەمە ئەم دەقە باوەش لە هاوچەرخیی دەکاتەوە. ئەو هاوچەرخییەی کە بێ وچان لە ڕابردووی خۆی دەکۆڵێتەوە و وەکو پێداویستیش باوەش بۆ ئێستا دەکاتەوە. سەرەڕای ئەوەی ئەم درەختە لە



سەر خاکی یۆنان شین بووە، بەڵام ڕەگەکانی ئەو جوگرافیایە تەی دەکەن، هەر لێرەشە یەکێ لە نهێنییەکانی نووسینی شیعرمان بە ئاشکرا دەکات.

دەست بۆ نهێنییەکەیش درێژ دەکات کە پێویستە شیعری کوردی هاوچەرخ بەجەختەوە پێی لەسەر داگرێ، ئەویش ئەو تێکڕاییەیە کە چ زیهنێکی تەندروست داوای دەکات، چ دەقێکی شیعریی پوخت بەدوویدا وێڵە و دەیدۆزێتەوە.

بۆ ئەوەی ئینسان بەرگریی لە بەئینسان بوونی خۆی بکات و شیعریش کۆڵەگەیەکی ئەستووری ئەم بەرگریکردنە بێت، دەبێ شیعر بەفراوانی سەیری دونیا بکات و بەووردی سەیری خودی خۆی بکات. بەتایبەت لە ئیمڕۆدا، کە سەرتاپای شتەکان کەوتوونەتە ژێر هەڕەشەوە: جوگرافیا لە ژێر هەڕەشەدایە، ئەمەش بەتەنها بەسە بۆ ئەوەی هەڕەشە لە داهاتووی مرۆڤ بکرێت، بەبێ ئەوەی باسی ئایدۆلۆژیای بنبەستی هەموو فیکرێک بکەین کە لە دەمارگرژییەوە سەر هەڵدەدات؛ ئەم دیاردەیەش نەک تەنها لە ڕۆژگاری ئیمڕۆماندا لە تەشەنە کردن دایە، بەڵکو ئینسانییەت بەرەو هەلاکەتی ڕاستەقینە دەبات.

تەنانەت ئەم ئایدیۆلۆژییەتە زۆر جار لە شیکلی گرووپی جلەو ترازاوی سوپرا- ناسیۆنالەوە دەردەکەوێت، بەڵام زۆر جاریش لە شیکلی دەوڵەت و دامودەزگای ڕێکخراوەوە سەقامگیر دەبێت. هەندێ جار لە ژێر ئالای عەلمانییەتدا تەونەکانی دەهۆنێتەوە، هەندێ جاریش لە ژێر پەردەی عەقائیدییەکی گرژ و گۆڵ، بەڵام لە کۆتاییدا هەر هەموویان دەڕژێنە یەکترییەوە.

ڕاستە وەزیفەی شیعر ئەوە نییە لەم دیاردانە بکۆڵێتەوە، بەڵام دەقی کۆک، ئەو دەقەیە ئەم دیاردانە فەرامۆش ناکات، بەبێ ئەوەی بخلیسکێتە نێو زەڵکاوی سیاسەتەوە.

ئیلیتیس، بەشیعر باسی تەجرەبەی تاراوگەمان بۆ دەکات، بەشیعر باسی جوگرافیای یۆنانمان بۆ دەکات، هەر بەشیعریش باسی کەلەپوورمان بۆ

دەكات. تاراوگە واتا زاڵبوونی فیكریی تاكڕەوی و لێرە هەڵبەتە سیاسەت بەشێكی فراوان لەم پانتاییە داگیر دەكات. جوگرافیاش، ئەو فەزا زیندووەیە كە ئینسان ئاوێتەی سروشت دەبێت و لەو تێكڕاییە دەگەڕێ كە لەوەوە پێش ئاماژەمان بۆی كرد، كەلەپووریش، لە دونیای زیهنییەوە، بۆ كەش و تەقسە جوداوازەكان، چ پێش یۆنانی مەسیحی یا پاش بڵاوبوونەوەی ئەو ئایینە، چ زمانی یۆنانی كۆن بیت چ زمانی یۆنانی نوێ، چ كەرەسەی شیعری كۆن بێت چ كەرەسەی شیعری نوێ.

كەلەپووریش تەنها ئەو كات زیندووە ئەگەر هات و دیالۆگومان لەگەڵی چێكرد و هێنامانە دوو، دەبێ لەوەش دڵنیا بن كە ڕابردووش زمانیكی پاراوی هەیە، بەڵام چ ڕابردوویەک و چۆنیش تەماشا دەكرێت!

ئەحمەدی مەلا

٢٠٠٢/٥/١٣ - ئیسپانیا



## پێشەكی چاپی فەرەنسی(١)

ئێستا تیشكە و كاتی یەكەمیشە

..............................................

بۆ ئێستا بۆ ئێستا عەدەمە و

بۆ هەتا هەتاییش گەردوون تەنک، بەڵام ڕۆچوونی مەحاڵە!

(تو ئەكسیۆن ئێستی)

بەدرێژایی دەقەكەی تو ئەكسیۆن ئەستی، پیرۆزباییمان بەبێ بوێریش بۆی هەڵبژارد، پێش «مەریەمی تەمەكان»و «درەختی ڕوونبین» و «چواردەمین جوانی» ، بەیەكێک لەو شیعرانە دەژمێردرێت كە سەركەوتن و شكۆ دەدەنە ئۆدیسیۆس ئیلیتیس. سەرەتا لە یۆنان چونكە ئەمە كتێبێكە بەرهەمی جەنگ و تاراوگەیە. كاتێک دەمانەوێ نیشتیمانێک بدۆزینەوە، كاتێک بەپێوەری نوقسانیش شتێک بپێوین و كتێب - پەرستگا، كتێب - كاتێدرال، جۆرێكە لە سانت سۆفیا (القدیس صوفیا) كە یۆنان كۆدەكاتەوە و دەیبەخشێتە یۆنانییەكان و هەروەها دەیبەخشێتە جیهانیش، ئەزموونی دەساڵی سەخت، ئەمەش چاكترین هەلە بەنیسبەت شاعیرێكی دوورەوڵاتەوە، بۆ ئەوەی نیشتیمانێک بەوشە دروست بكات.

هەر وەكو بەرهەمەكەی، بەڵكو لەوەش زیاتر: سەرئەنجامی بارودۆخی ئینسانی هاوچەرخە. هەوڵێكە بۆ سەرلەنوێ دروستكردنەوەی، ئەمەش بەنیسبەت فیكرەوە، دەبێتە پانتاییەک كە بەرگری «لە ئاسن و ئاگر» دەكات، بەرگری لە سەرهەڵدانی فاشییەت دەكات و بەرگری لە گەشە كردنی فاشیزمێک دەكات كە خۆی لە ژێر پەردەی تەكنەلۆژیا و بازرگانی شاردۆتەوە. بەشێوەیەكی تایبەتیش، ئەم حەسیلەیە لە لایەن هەرە كۆنترین میراتهەڵگری شارستانییەتەوە دێتە دی، دەكرێت كاریگەریەكی زۆر

(١) ئەم پێشەكییە لە هەندێ شوێن كورتر كراوەتەوە. (وەرگێڕ).

ڕاستەوخۆشی لەسەر دروستکردن و خەملاندنی شارستانییەتی ڕۆژئاوا هەبێت. شتێکی بەڵگە نەویستە کە یۆنانییەکان بنە میراتهەڵگرێکی سروشتیی ڕابردووی مێژوویی و ڕۆشنبیریی خۆیان. لەلایەکی ترەوە، با دان بەئەوەشا بنێن کە وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا هەرگیز واقورمانی خۆیانیان بەرامبەر بەیۆنان نەشاردۆتەوە - بەشێوەیەکی زۆر تایبەتیش فەرەنسا- خۆی بەکۆ- میراتهەڵگری ئەو شارستانییەتە دەزانێ: هەندێ جاریش بەلای خۆیدا ڕایکێشاوە، بەتایبەت لە سەردەمی فلۆتینەوە[٢] کە هەر دوو ڕچەی جوولەکە و مەسیحییەت و ڕچەی ئەفلاتۆن لە یەک بۆتەدا ئاوێتە کردووە و تواندوێتییەوە... تا ئاستێک واش کۆ- میراتهەڵگرە کە ناکرێ مێژووی خۆمان، چ وەکو ڕووداو، چ وەکو فیکر، بەبێ یۆنان بخوێندرێتەوە: سەردەمی ڕاپەڕین، شۆڕشی فەرەنسا، مەلحەمەی ناپلیۆن، چێژ بۆ دیموکراسییەت، ئیدیالی ئازادی!

خوێندنەوەی ئلیتیس، سەرەڕای ئاڵۆزی و قورسیی، زمانێکی ئەنالۆژییە و بەگەڕانەوەیەک بەرە سەرچاوە دەکرێ لێکبدرێتەوە. ئەمەش دوو فاقەیە، جا چ بەنیسبەت ئلیتیس خۆیەوە، چ بەنیسبەت خوێنەرانیشەوەیە؛ بەجۆرە وەرچەرخانێک لەم ڕووەوە دەژمێردرێت و تو ئەکسیۆن ئێستیش دەبێتە پنتی ئەم خاڵی وەرچەرخانە.

***

باشە با بزانین چ شتێک وای لە ئیلیتیس کردووە ( ئەو و نووسەرانی وەچەکەی خۆی، وەکو ئەمبیریکۆس، ڕیتسۆس، ئەمە تەنها بەنیسبەت شاعیرانەوە) کە خۆی بەشتی واوە خەریک بکات. چەند توخمێکی

(٢) بەدامەزرێنەری ئەفلاتوونییەتی نوێ دەژمێردرێت. (٢٠٤-٢٧٠) لە شاری لیکۆبۆلیس لە میسر لە دایک بووە، زاهید و عاریف و فەیلەسووفە. ویستی ڕچەی ئەفلاتوونییەت و ئاینی جوولەکە - مەسیحییەت تێکەڵ بکات. ئامۆژگاری و وانەکانی لە ژێر ناونیشانی « تاسوعات» و «مونجید» دا کۆ کراونەتەوە. (وەرگێڕ).



ئۆتۆبیۆگرافی لەم ڕووەوە بەگرینگ دەزانرێت.

ئیلیتیس- ناوێکە دوای نیولۆژیسمێکی دوورو درێژەوە پەیدا بووە و پێشناویشی[٣]، ئۆدیسیۆس (ئولیس) پرۆگرامێکی تەواومان دەخاتەوە یاد. لە ٢/سەرماوەرز/ ١٩١١ لە دوورگەی کریت، لە ئیراکلیۆن هاتۆتە دونیاوە. کوڕی بچووکی خێزانێکە، پێنج برای لە خۆی گەورەتری هەبووە، لە خانوویەک چاوی بەدونیا کردۆتەوە کە دەکەوێتە سووچی شەقامی ئاریان و پاسیفانیەوە، لە گەڕەکێک کە بە«حەوت تەورەکە» بەناوبانگە. ئەم تەورانە، هەر وەکو لە شیعرەکە ئاماژەی بۆ کراوە، بەواقیع وجوودیان هەبووە: ڕەمزێکی کۆنی حەوت فەوجی لەشکری عوسمانییە، مەبەست لە داگیرکەرانی شارەکەیە، لە سەرووی قەڵاکەی تەنیشت چەسپ کرابوون و کاتێکیش کریت لە ساڵی ١٩١٢ دەکەوێتەوە دەست یۆنانییەکان، هەر حەوت تەورەکە بەردەدرێتەوە، یەک ساڵ دوای لە دایکبوونی شاعیر ئەمە ڕووی دا. ڕەمزێکی کریتی کۆمپلێتە، چونکە دوو لایەنەیە، ژێر دەستیی و سەربەستی دەگرێتە خۆی. لەو حەوت تەورەش، چواریان لە مۆزەخانەکەی شاردا پارێزراون.

ناوی باوکی، پاناژیۆتیس ئەلپودێلیسە، هاوشارێکی خۆی خواست، ناوی ماریا (مریەم) ڤرانا بوو، خێزانی هەردووکیان خەڵکی دوورگەی میتیلێن بوون. دەبێ ئەوەش بهێنینەوە یادی خۆمان سافۆی ژنە شاعیر لەم دوورگەیە ژیا و ئیلیتیش کتێبێکی تەواوی بۆ تەرخان کرد و لە تو ئەکسیۆن ئێستیش دا ئاماژەی بۆ کردووە: « ئێرۆس بەخۆی و پاڵتۆ قرمزییەکەیەوە».

(٣) لە زۆر زماندا، لێرە بەنیسبەت زمانە ئەوروپییەکانەوە، مرۆڤ بەلایەنی کەم دوو ناوی هەیە، یەکەمیان ناوی شەخسییە وەکو « پیار» کە پێشناوی بۆ دانەنێن و دووەمیشیان ناوی خێزان، یا بنەماڵەیە کە ئەمیان نەگۆڕە؛ کە لای ئێرانییەکان بەناوی «خانوادە» دەناسرێتەوە. (وەرگێڕ).



PDF 4 KURD

ئۆدیسیۆسی لاو و خێزانەکەی تەنها هەر سێ ساڵی دیکە لە ئیراکلیۆن دەمێننەوە: لە بەرەبەیانی جەنگی جیهانی یەکەم، لە ساڵی ١٩٤١، مسیۆ ئەلیپودیلیس، خاوەن کارگەی ڕۆن و سابوون، هەموو خێزانەکە دەباتە ئەسینا، لە ئاپارتمانی ژمارە ٩٨، لە شەقامی سۆلۆنۆسو نیشتەجێ دەبن. شتێکی سروشتییە کە هاوینان بۆ تەحتیل و پشوودان بەخاوخێزانەوە بگەڕێنەوە بۆ دوورگەی کیتیلێن و کریت و چەندین دوورگەی دیکەی دەریای ئیجە. درەنگتر تێمی دوورگەیی و کەشتیوانی، دیالۆگی نێوان دەریا و خاک - خاک وەک دەریا دەبینرێت و دەریاش وەکو باخچە- دەبێتە یۆنانێکی حەمیمی لای شاعیر. ئەمە و ئەو بایانەی کە پاڵ بەچارۆگەوە دەنێن و شوانی شەپۆڵەکانن.

ئۆدیسیوسی لاو، هەر دوای خوێندنی سەرەتایی، ئیتر دەست بەنووسینی شیعر دەکات. بەڵام بۆ پراکتیکەردنی نووسینیش تەنها مۆدێلی شاعیرانی، ئەگەر بەجارسکەریان ناو نەبەین، ئەوە شاعیرانی تەقلیدی و ئەکادیمی  بوون، کە شاعیر چنگی دەکەوتن. «هەستی بەپێداویستی شتێکی جوداواز دەکرد». یەکێ لە کتێبخانەکانی ئەسینای ئەوکات کتێبی فەرەنسی و کتێبی پێش-ڕەوی لێبوو: ڕۆژێکیان ئودیسیۆس کەشفی کتێبی عەشقی شیعری ئیلیوار دەکات، هەر خێرا ئەم جۆرە نووسینە غەزووی دەکات، چونکە لە ستیلەکەی بوێری پێوە دیارە، چ لە جۆری تەعبیرکردن، چ لەو ڕێڕەوەی کە چێژی بۆ ئازادی و جیاوازیی هەیە، دەیەوێ شتی زیاتری لە بارەی ئەو ڕێبازەوە دەسگیر بێت کە ئەو کات زۆر کەم ناسراو بوو ئەویش ڕێبازی سوریالی بوو- دوای ئەوەی نامەیەک بۆ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ژۆزی کۆرتی دەنووسێ، تەنها هەر چەند کەتالۆگێکی چنگ دەکەوێت و بەس.

لە ساڵی ١٩٣٠ لە کۆلێجی یاسا، لە دانیشگای ئەسینا خۆی ناونووس دەکات. لە ساڵی ١٩٣٥، لە کاتی تەواوکردنی دانیشگا و بەدەستهێنانی بەڵگەنامەکەی دەبێت، بەسەرهاتێک دەقەومێ: یەکێک بەناوی ئەندریاس



ئەمبیرکیۆس، کە لە پاریس گەڕابووەوە، کۆنفرانسێک لەسەر سوریالییەکان چێ دەکات و پێشانگایەک لەو بارەیەوە دەکاتەوە. ئیلیتیس کە ئەوکات دوانزە ساڵ لەو منداڵتر دەبێت، پەیوەندییەکی قووڵ و یەکجارەکی لەگەڵ دروست دەکات. ئەندریاس ئەمبیرکیۆس یەکێ بوو لەو کەسانەی کە هاوڕییەتی لەگەڵ کەسایەتێکی زۆر گرینگ دروست کردبوو، ئەویش ئەندرێ بروتۆن بوو، هەروەها کەم تا زۆریش لەگەڵ گشت سوریالیستەکانی پاریس. شاعیر و دەسپێشەخەرە لە ناساندنی شیعری سوریالی لە وڵاتی یۆنان، هەموو کتێبەکانی هاوڕێیە فەرەنسییەکانی لەگەڵ خۆی هێناوە و زۆر بەدڵ فراوانییەوە بەئیستیعارە دەیداتە ئەو شاعیرە لاوە.

ئا بەم شێوەیە ئیلیتیس هەنگاو دەنێتە نێو فەزای شیعری جیهانی و لە هەمان کاتیشدا هەنگاوێکە بەرەو شیعری هاوچەرخ. ڕامبۆ و ژووف، ئیلیوار و لۆترێئامۆن... هتد تەرجەمە دەکات. هەر لە هەمان ساڵیشدا، شیعرەکانی لە گۆڤاری لێتر نوڤێل واتە ئەدەبی نوێ بڵاودەکاتەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەم گۆڤارە نوخبەوییە، شاعیری بەناوبانگ و تازە ناسراویش دەگرێتە خۆ. ئەمە و هێڵێکی ناوەکیش وەکو هێڵی فیکرێک بەناویا تێپەڕ دەبێت: ئەویش «دۆزینەوەی ڕوخساری ڕاستەقینەی یۆنانە» ئەم فیکرەیە هەر وەکو چۆن فیکرەی ئەو شاعیرە لاوە بوو، فیکری گۆڤارەکەش بوو. چونکە یۆنانییەکان هەستیان بەوە دەکرد کە سیمای یۆنان لە لایەن مەفهوومە ڕۆژئاواییەکانەوە کە ئەویش لە چەرخی ڕاپەڕینەوە هەڵقوتا بوو، وردە وردە دەسڕێتەوە. مەبەست لە مەفهوومی جیهانێکی «کلاسیک»، کەهەنووتی، سپی، بێگەردە کە نە حەقیقەتی نووستووی شیعری هۆمێری، نە هی بیزەنتە نەیانتوانی زیهنییەتی ئەورووپییە هێلینییەکان بگۆڕن!

سوریالییەت هەلێکی بەخشییە شاعیر بۆ ئەوەی خۆی لەم هیشک و برینگییە قوتار کات. بەبێ ئەوەی خۆی فیکرەی «ئارشیتەکتوری = ساخوتمانی» ئەندازەی بیناسازی فەرامۆش کات، مەبەست لە زیهنی

پارثیۆنە کە سێفێریسی شاعیر کردی بەماددەی بەرهەمێک، ئەویش مەبەست لە (شەش شەو لە ئەکرۆپۆل)ە. ئلیتیس سوود لەو ئازادییە ناوەکییە وەردەگرێت و جارێ بەسوریالی بوونی خۆشی ئیعلان دەکات: ئەنجامەکەشی ئەوە بوو کە لە ساڵی **١٩٣٩** لە دیوانی یەکەمیدا، هەر لە ناونیشانەکەیەوە بۆنوبەرامەی مەنیفێستی لێوە دەهات، ئەویش ئاراستەکان بوو. بەڵام بۆ ساڵی دوایی، جەنگی جیهانی دووەم هەڵدەگیرسێ. ئیتر ئیلیتیس بۆ خزمەتی سەربازی، وەکو مولازیمی ئیحتیات دەبێ بچێتە بەرەی ئەلبانیا بۆ بەرەنگاری کردن لە هەڕەشەی ئیتالیا. لەم ئەزموونەدا چەند جارێک بەرەو ڕووی مەرگ دەبێتەوە و تەنانەت نەخۆشیش ئاسەواری زۆری تیا جێدەهێڵێ: بەنەبرەیەکی تیژی نوێیەوە، لە هۆنینەوەیەکی شیوەن ئامێز دەچێت، درکی پێ دەکرێت، بەتایبەتی لە دیوانی سێیەمی کە لەسەر ئەم ئەزموونە بنیاتنراوە: سروودی جوامێری و شیوەنێک بۆ مولازمێکی لەناوچوو لە ئەلبانیا، کە چەند سیمایەکی ئەم شیعرە لە تو ئەکسیۆن ئێستی دا ڕەنگ دەداتەوە.

لە نێوان ساڵانی **١٩٤٨-١٩٥١**، شاعیر دەچێتە پاریس. لە سۆربۆن شیعری فەرەنسی دیراسەت دەکات، هەروەها گەلێ لە کەسایەتی ئەدەبی و هونەری دەناسێ. ئیلیوار، بروتۆن- ئەمیان کەمێ بەزەحمەت، چونکە زۆر سارد بوو لەگەڵ شیعری سیاسی-، تزارا، ڕنێ شار، ژووف، ڕوڤێردی، چەند بیانییەکیش وەکو ئوکتاڤیۆ باث، گیسێپ ئەنگارێتی. لە ناو هونەرمەندانیش، ماتیس و شاگال و لۆرێنس و ژیاکۆمیتی و بێگومان پیکاسۆش؛ هەر بەڕێکەوت ئەوکات لە ناو جەرگەی «قۆناغی یۆنانی»دا دەبێت: ئا لەو کاتەدا ئیلیتیس لە گۆڤاری ڤێرڤ کە لە لایەن تێریادی هاوڕێیەوە بەڕێوە دەچوو، لێکۆڵینەوەیەک لەمەڕ «هاوکێشەکان لە لای پیکاسۆ» بڵاو دەکاتەوە. دواتر، شیعرێکی درێژی بۆ تەرخان دەکات، کە لە دیوانی ئێتێریۆت لە چیریکۆوە تا ڕۆما، بڵاوی دەکاتەوە، بەڵام هەمیشە خەون بەزێدی خۆیەوە دەبینێ، ئەم وشەیە بۆ یۆنانیان دەلالەتێکی حەمیمی



و چڕی هەیە، کەمتر لە لای ئێمە...

***

کاتێکیش لە ساڵی **١٩٥١** دەگەڕێتەوە یۆنان، لە مێشکیدا و لەسەر کاغەزیش، ماددەی کتێبێکی شیعریی پێیە، لە ڕووی ساختمانی شیعرییدا، تا بڵێی ئەسیڵە، هەموو توخمێک کە ڕەچەڵەکی یۆنانی بێت، بەدرێژایی زەمەن و پانتایی جوگرافی، سوودی لێ بینیوە. لە ساڵی **١٩٥٩** لە ژێر ناونیشانی تو ئەکسیۆن ئێستی دا بڵاوی دەکاتەوە، ئەم سیغەیە لە تەقسی بیزەنتەی ئورتۆدۆکسەوە وەرگیراوە، کە دەکرێ بە«ئەو شتەی کە شایانی شکۆمەندیی کردنی هەبێ» تەرجەمە بکرێت. ئەم ناونیشانە شتێک لە لای ئیلیتس ئاشکرا دەکات کە ئەویش ئاوێتەکردنەیە کە لە نێوان بەها ئاینییە تەقلیدییەکانی یۆنان- مەبەست لە مەسیحییەتە- و بەهاکانی جیهانی یۆنانی پێش - مەسیحییەتە، کۆ بکاتەوە. ئەم سەنتێزە، واتە ئەم ئامێتەکردنە، لەژێر «چاودێری سوریالیسمی پیر-یۆحەننادا» خۆشە کراوە، هەڵۆی پاثمۆس، هەموو ڕەمزییەتێک کە پەیوەندیی بەقەبارەی ڕوحانییەتەوە هەیە دەگرێتە خۆ، کاتێک شیعرەکانی ئیلیتیس دەخوێنینەوە، دەبێ هەمیشە ئەم ڕەمزەمان لە یاد بێت.

بەکورتی، ئەم دیوانە زۆر تایبەتە، جۆرە تێکەڵبوونێکی سۆفیمەشەرەبانەی شاعیرە لەگەڵ نیشتیمانەکەی خۆی ( ئەزەلی)، ئامێتەبوونێکە مێژووییشە، لە هەمان کاتیشدا تێپەڕ - مێژووییە ( واتە بەناو مێژوودا تێدەپەڕی و بەهای خۆی لە دەست نادات «وەرگێڕ» )- ئەمە جۆرە نوێکردنەوەی شناسنامەی تایبەتی خود و - کۆگەلە- ئەمە گەڕاندنەوەیەکی بەهای میللەتێکە بەرەو بەها جەوهەرییەکان، کۆکردنەوەی گشت ئەو وێنانەیە، ئەو چاخ و بەهایانەیە کە خەسڵەتی یۆنانی دیاری دەکەن. پێش ساڵی ١٩٦٠، دەنگدانەوەیەکی مەزنی دەبێت و خەڵاتی دەوڵەتیش دەدرێتە خاوەنەکەی.

تو ئەکسیۆن ئێستی، ئیتر بووەتە میراتی یۆنان، چەندین لێکۆڵینەوەی



PDF 4 KURD

لەمەڕ دەکرێت. بەلایەنی کەم چوار پێنج لاپەڕەی بیبلۆگرافی دەگرێتە خۆ. (لە هەمووویان گرینگتر «تەفسیری» تاسۆس لاگنادیسە. چەند بڕگەیەکیشی لە لایەن میکیس تیۆدۆرکایس کراوەتە مۆسیقا، کە لە لای ئێمە کارێکی مومکین نییە کە شاعیرێکی وا قورس، با بڵێین یەکێکی وەکو مالارمێ، شورەتێکی وا میللی بەخۆیەوە ببینێ...

***

پێش ئەوەی باسی چەند خەسڵەتێکی ئەم شیعرەش بکەین و ببنە یاریدەدەرێک بۆ چوونە ناو ئەم جیهانەوە، با سەرنجی خەسڵەتێکی شیکلی ئەم قەسیدەیە بدەین، چونکە لەوە پێش باسی «کاتێدرال»مان کرد. بەشێوەیەکی تێکڕایی، جۆرە لە یەک مارەکردنی وردەکاری و سەربەستییە. ئەمەش دەبێتە خەسڵەتی هەر هەموو شیعری ئیلیتیس: «غینائییەتێکە کە دامەزرێنەری میعماری خۆیەتی و میتافیزیکییەکی هەتاویە» (ناونیشانی بابەتێکی بڵاونەبووەوەیە) کە هاوسەنگییەکی تایبەت لە سەرووی هەموو چاخەکانەوە لەگەڵ موجیزەی یۆنان دا یەکدەگرێتەوە.

سێ گومەز، «ئەفراندن»، «ئازار» و «تەهلیلەی[٤] سبەینان»، سێ بەش بەدەوری ژمارەی ٥، ٦، ٧دا ڕێکخراون. ٧ سروودی ئەفراندن بەڕووناکیی و ئافراندنەوە گرێ دراون، پەیوەندەی بەوەوە هەیە کە بۆ یەکەمین جار جیهان ببینرێت. ئەم ژمارەیە تایبەتە بەئەپۆلونیاوە. ٦×٦ یا ٣×١٢ی شیعرەکانی ئازار، دەکەنە ٣٦: ئەمەش لەگەڵ تێتراکتیسی فیثاگۆرسی (چوارینەکانی فیثاگۆرس) هاوجووت دەوەستن، ژمارەی ٦٦٦، ژمارەی ئاژەڵانی ڕۆژی قیامەتە (سفر الرؤیا)[٥]. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەتەهلیلەی سبەیانیشەوە

(٤) لە بنەڕەتدا ئەم وشەیە عیبریە، ڕەچەڵەکەکەشی «هەلەلویا»یە واتە «ستایشی خودا بکەن». (وەرگێڕ)
(٥) مەبەست بەشێکی ئینجیلە.(وەرگێڕ).



هەبێت، بەتایبەت لە دەوری ژمارەی ١٣دا ڕێکخراون، ڕەمزی دۆناودۆنی هەمیشەییە. ناشمانەوێ زیاتر بچینە ناو ئەم بابەتەوە، ئازار+ تەهلیەی سبەینان=٨١ شیعر، ٨١ کێش هاوجووت لەگەڵ نۆیەمی خشتەی کۆ ڕادەوەستن، بەنیسبەت فیثاگۆرسییەکانەوە، واتە کۆتایی هاتنی ماددەی ئافراندن. یاقووب ٨١ فریشتە دەبینێ کە بەسەر پەیژەکەدا سەردەکەون و دێنە خوارە،. بودا ٨١ ساڵ ژیا و ٨١ ڕاوێژکاریش دەوریان لێ دابوو... بەڵام ٩×٩ سێ توان سێیە، مەسیح، پێوانیش لەسەر بناغەی ٩ پەیوەندی بەکیژەکانی ئەپۆلۆنەوە هەیە، کە خوداوەندەکانی هونەر دەگرنەوە... ئەو بەشەی کە دەکەوێتە ناوچەقی تەهلیەکانی سبەینانیشەوە کە لە ١٩ توخم پێکهاتوون: ژمارەی یەکەی سێیەمینی نۆیەش و حەوتەمین سێبەشی خشتەی کۆدا، ئەمەش بەواتایەکی زۆر فراوان، بەنیسبەت ئەلشیمیستە نوێیەکانەوە، بەجەوهەری وزە دەدەرێتە قەڵەم، بەپێی: زانستی تەرازووشەوە «بەپێی عیرفانی ئیسلامیی،» جیهانی زاهیر و دەرکەوتوو گوێڕایەڵی ئیقاعی ١٩یە» (بڕوانە هینری کۆربان، لە گۆڤاری پەرستگا، ڕامان). لە دەوری ژمارەی ٧و١٢شدا، لە دوو بەشەکەی دیکەی تەهلیەی سبەیناندا، کە تێپەڕین لە جیهانی جەوهەری یەکەمەوە بەرەو بەکۆ بوون دەگەیەنێ، هەڵبەت بەتێپەڕ بوونی کات؛ شتێکی ڕێککەوت نییە کە لە ناو هەتاو –چەق– ٧ تەبەقەی ئاسمان، ڕووناکی دەگەیەنێ و موسا وەکو پێغەمبەر حزووری دەبێت و وەکو ئیمامیش دەدوێ، هتد.

خۆ ئەوەشمان دێتەوە یاد کە لە پانتایۆنی کۆنی یۆناندا، تاکو پیش ٨٠٠ پێش هاتنە دونیای مەسیحەوە، ڕۆژمێرێکی نۆینە بووە. بە کورتی بەبێ ئەوەی شیکردنەوەی قووڵ و ورد ئەنجام بدەین، سەرنجی ئەوە دەدرێت کە بەکارهێنانی ژمارە چەند شوێنێکی گرینگ لە بونیاتنانی پەرستگای وشە پێکدەهێنێ «ئاسمانی بێگەرد» کە تو ئەکسیۆن ئێستییە. چونکە ئیلیتیس وا بیردەکاتەوە کە «ئەگەر بێت و خرافات تاکو دوا تخووبی بێگەردیی ماتماتیکیانە پاڵی پێوەبنرێت، ئەوە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی

دەست بەسەر دراوە جەوهەرییەکانی جیهاندا بگرین» (مەریەمی تەمەکان).

هەر لەبەر هەمان هۆیە، (پشت بەکتێبە بەنرخەکەی تاسۆس لاگنادیس دەبەستین) بۆ ئەوەی نەخشەیەکی هێڵکاری گشتیی بۆ بەرهەمەکەی ئیلیتیس بکێشین کە یارمەتیمان دەدات لەوەی بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش شێکلی قەسیدەیەکە ببینین کە بەشێکی لە واتا شاراوەکانیش دەگرێتە خۆ. (با ئەوەش بهێنینە یادی خۆمان کە پەرستگا لە هەمان کاتدا بچووکردنەوەی ماکرۆکۆسمیشە، «ئەو جیهانەی کە ڕۆچوونی سەختە»، و میکرۆکۆسمیشە «جیهانی تەنک»ە) ئێمە باسی دووبارە دروستکردنی وێنەی یۆنانمان دەکرد، واتە دروستکردنەوەی پەرستگا. مەزەنەی ئەوەش دەکەین کە دەبێ ئەم شیعرە چەندێ ئەو تمووحەی هەڵگرتبێ. ئەگەر بێت و سێ بەشە گەورەکەی شیعرەکە بە«سێ ڕۆژ» هێمای بۆ کرابێت، ئەو سێ ڕۆژەی ئاخاوتنی مەسیحە کە لە ئینجیل دا هاتووە، ئەوکات باش لەوە تێدەگەین کە ئاماژەکردن بۆ «ئیدو ئێگۆ لاپۆن» لە سەرەتای ئازار دا، کە لە زمانی یۆنانی دا و ئەم مۆسیقایەی هەیە «ئێکسێ هۆمۆ»، چ گرینگییەکی هەیە.

با ئێستاش، ڕۆبچینە نێو قووڵایی شیعرەکەوە. سەرەتا بەرەو ئەو فیکرەیە بڕۆین کە شاعیر لەمەڕ شیعر و شیعرییەت و ڕۆڵی شاعیرەوە دەیخەملێنێ. بێگومان، لەم ڕووەوە، تو ئەکسیۆن ئێستی، کتێبێکی دامەزرێنەرە، سوودبەخشترین مەبەستیش دەپێکێ.









*

لەم دەقـەدا، ئیلیـتـیس ئامـاژەیەکی زۆر بۆ ئێـسـتـا و ڕابردوو دەکـات؛ ڕابردوویەک لە بۆچوونێکی فەیلەسوفانەوە، دەوڵەمەندترین جیهان دەگرێتە خۆی، چونکە بەبێ یۆنان، فـەلسـەفە مـومکین نەبوو پەیدا بێت. لەم چەند لاپەڕەیەدا، هەر تەنها دەکرێ چەند خاڵێک ڕوون بکرێتەوە. هەر لەیەکەم دێڕی ئـافـراندنەوە بۆ دوادێڕی تەهلیلەی سـبـەینان کـە لە سـەرەتای ئەم پێـشـەکـیـیـەش دانراوە، بەنیـازی ئەوە دانەنراوە کـە ببـێـتـە دەلیل بۆ خوێندنەوە، بەڵکو لە پێناوی ئەوەی کە بەخوێندنەوەیەکی خێرا ئەو پرۆژەیە ئەنجام نەدرێت...

با چەند وشـەیەک لەمەڕ ناونیشـانەکەوە بلێین: تو ئەکسـیۆن ئێستی. دێتەوە یادمان کە ناوی دایکی شاعیر مەریەم بوو. شیعرێکی درێژیش بەم ناونیـشـانە و بۆ ئەم کـەسایەتییـە سـەرەکـییـە نووسراوە، لەم زووانە هاتە بەرهەم بەڵام سـیـغـەی ئەکـسـیـۆن ئێـستی پەیوەندییەکی بنچینەیی لەگەڵ مـەریەم دا هەیە، کـە دایکی عـیـسـایە: ئا بـەم شـێـوەیە لە دێڕیکی تەپەی ئاتۆس، ئامـاژە بۆ ئیـقـۆنەیێکی پاکـیـزە (مـەریەمی عـەزرا) کـراوە. هەروەها ناونیـشـانی سـروودێکیـشـە کـە بۆ پاکـیـزەیەکی بیـزەنتـیی وتراوە. لە کـۆتاییـشـدا، ئەم سـیـغـەیەش لە زۆر کـەش و تەقـسی ئارتۆدۆکـسی دا، دەوترێ و دووبارە دەکرێتەوە.

واتە ئەو ڕەوتەی کە ڕەمزی ئایینی و دونیەوی دەبووژێنێتەوە و تیکەڵ بەیەکـتـری دەکـات، ئەمـە خـەسـڵەتی فـیکرێکە کە هەوڵی سڕینەوەی ئەو دیـوارە دەسـتـکردە دەدات کـە ئەم دوو بـوارە لە یەکـتـر جـودا دەکـاتەوە، مـەبەسـتی سـڕینەوەیە زیـاتر وەک لە مـەحکوم کـردن. بۆ ئەوەی لەوەش تێبگەین باشە چۆن دەکرێ ئەمە بەوە بشـوبهێندرێت کە گەڕانەوەیەک بێت بەرەو ناخی یۆنان، جـا دەبێ ئەو کـات لـەوە تێـبگـەین کـە جـیـاوازی هەرە گەورە لە نێوان هۆشیاری یۆنانی لە وشەوە هاتۆتە دی و هۆشیاری ئێمەش،

تەنها وشە بەکار دەهێنێ، ئەمەش بەواتای ئەوەی کە زمانەکانی ئێمە[٦] واتە ئەو زمانانەی کە دوای فەلسەفە هاتوونەتە کایەوە، بەزمانی درووست بوو دەژمێردرێن و لە بەینی زاتی بچووک و گەورە و لە بەینی بچووک و کەینوونە[٧]- ئەگەر بێت و ئەم وشانە واتایان هەبێت! بەجۆرێکی وا هەر چ کاتێک بەکارهێنرابێت، وشەی یۆنانی بەئێستایەکی تەبلیغکەر بەکارهاتووە، واتە، تەبلیغی دەست بەسەرگرتنە. ئیلیتیس زەمەنی ئێستا لە ئیعلانی مەریەمیش بەکار دەهێنێ، مەبەست لە ئیعلانی ئاوس بوونێتی لە لایەن ڕۆحی یەزدانەوە و لەوە ئیتر وشە، ئاخاوتن پەیدا دەبێت و هەندێ لە ئەفسانەکانی یۆنانیش لەسەر هەمان ڕێباز سەقامگیر بوونە.

(٦) مەبەست زمانە ئەوروپییەکانە. (وەرگێڕ)

(٧) (être) و (Etre) دوو وشەن، تەنها جیاوازی شێکلی ئەم دوو وشەیە کە یەکەمیان بەپیتی بچووک و دووەمیشیان بەپیتی گەورە نووسراون. لە دەقە فەرەنسییەکە بەم جیاوازییە شێکلییە، جیاوازی واتاییش درووست دەکات، ئێمە بەزاتی بچووک و زاتی گەورە تەرجەمەمان کرد. هەروەها (Etant)یشمان بەکەینوونە تەرجەمە کرد. (وەرگێڕ).



*

هاوکێشەی نێوان تەبلیغ و ژیاو کە بەشێوەیەکی لاوەکی پێی دەڵێن ڕێککەوت، تەنها ئەم ڕێککەوتەیە کە دەبێتە تاقیگەی بەها بەنیسبەت ئاخاوتنی شیعرییەتی یۆنانییەوە. ئا لێرەوەیە ئیلتیباسێکی زۆر، بۆ نموونە لە قەسیدەی تو ئەکسیۆن ئێستی دا بەدی دەکرێت، دونیایەک فیکرەی ئاڵۆز و وێنەی ئاڵۆز یەک لەسەر ئەویتر کۆ دەبنەوە کە سەر بەڕەوانبێژییەوە گەلێ سەرسوڕێنەرن. ئەم ئیلتیباسەیە کە دەبێتە جێگای ڕێککەوت.

ئەوەی پەیوەندیشی بەدامەزرینەوە هەیە، فەرموون گوێ بگرن:

**ئێستا تیشکە و کاتی یەکەمیشە**

**هێشتا قوڕ بوون**

**لێوان**

**بۆ تاقی کردنەوەی شتانی گەردوون دەخەملان**

ڕەنگبێ ئەو دێرە وێنانە، بەهەرە یۆنانیترین بژمێردرێن، بێگومان لە ڕێگای دارشتنی زمانەوانییەوە...

دێرە سەرەتاکانی ئیلیتیس بەئیقاعەکەی دەناسرێنەوە، ئەویش کێشی ئەلەکسەندەرییە[٨]- دەشکرێ بەجۆرێکی دیکەش شێکرێتەوە، بەپێی کێشی ئەنتیک جا ئەوکات جۆرە نزیکییەک لەگەڵ دێرەکانی سروودی نۆیەمی پیندار[٩]مان بۆ یەک ئالا ئەبێتەوە. ئەلەکسەندەری لە هەمان کاتدا هاوتەریبن و لە هەمان کاتیشدا هاوتەریب نین. چونکە بەکارهێنانی ئەو «چەندایەتییەی» کە واوی ئیزافەیەی کە لە دێڕی یەکەم و دێڕی دووەم

(٨) ئەم کێشە دوانزە برگییە. سەرەتا مەلحەمەکانی ئەلەکسەندەری پێ دەهۆنرایەوە. (وەرگێڕ).

(٩) شاعیرێکی غینائی گەورەی یۆنانە (٥١٨-٤٣٨ پ-ز)، قوتابی شمشاڵژەنی گەورە، سکۆپیلینۆس بوو. (وەرگێڕ).

دا بەکار هێنراوە، ئەم بەکارهێنانە کاریگەرییەکی ئەفسوونبەخش لە لای خوێنەر دروست دەکات ئەویش: برگەی ٧/٥، بوو ژمارەکە لای شاعیر زۆر ئازیزن، یا ٦/٦ کە بەژمارەی هاوسەنگیی ئافراندن دەژمێردرێت. ئەم بۆچوونەش هیچ هاوچەشنییەکی لەگەڵ ڕامانە تاوییەکاندا نییە، چونکە ئەم دیدەنیگایە جۆرە دیالیکتێک و دینامیکییەک کە لە قاوغێکی دیکەیە، ئەویان ستاتیکە، واتە نەبزێوە.

لە تەرجەمە فەرەنسییەکە گرینگییەکی زۆر دراوەتە ژمارە، هەر وەک چۆن لە دەقە یۆنانییەکەدا هەیە. ژمارەی هەر دێڕێک لەگەڵ تیۆری فیثاگۆرسی پابەندە بۆ ئەوەی دەلالاتە دەرەکییەکانی ئاشکرا کرێن. لەم ژمارەشانەوە تێگەیشتنمان بۆ گەردوونێک کە هەمیشە لە دۆناودۆن دایە، بۆ ڕوون دەبێتەوە؛ ئا لێرەدا لۆگۆس و ژمارەکان و لە تاکەوە بۆ جووت، لە بچووکەوە بۆ گەورە و ئەمەش بەگوێرەی چنینێک تاکو بڵێی ئاڵۆزە، پەیڕەوی کراوە.

لە ڕاستیش، ئەم پەیوەندییەی نێوان ژمارەیەک و ژمارەیەکی دیکە، ئەم بەرەوچوونە ناوەکییە، بەئێرۆس دەکرێ لێکبدرێتەوە، ماتۆری ئارەزووە بەنیسبەت جیهانێکەوە کە بەزلترین زیندەوەر دەژمێردرێت. دەکرێ ئەوەش بوترێت کە ڕەحمی جەوهەری ئەکسیۆن ئێستی ئەو پەیوەندییە کە لە نێوان لۆگۆس/ئێرۆس دا هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ بەرەبەیانی مێژووی یۆنان. لە زۆر شوێن ئەم پەیوەندییە خۆی ئاشکرا دەکات، بۆ نموونە:

**کاریگەریی دووکەڵ لە ڕابردوو دەبینین**
**ئەو یارییە بێگەردەی سروشتی تۆیە و**
**ئەم دەسەڵات و ئەم حوکمڕانییەی کە هی تۆن!**

ئەمە پەیوەندییەکی ئیراکلیتی تەواوە کە هەر هەموو ئەدەبی یۆنانی پێ زاخاو دراوە، هەر لە سەرەتای وتنی شیعرەوە، جا ئەرشیلۆک (ئەرخیلۆس) بێت یا سافۆ. یەکەم کە ئیزافەیە، ئەوەی کاریگەریی لەسەر ئێرۆس دا



نییە، ئەمەیە کە ئیلیتیس لە دێڕێکی ئۆنگاریێتی دا ئاماژەی بۆ دەکات کە لە «مەریەمی تەمەکان»دا دەیڵێت «لە گوڵێکی دەسکەنە کراوەوە بۆ یەکێکی تر بەخشراو، عەدەمێک هەیە کە تەعبیری لێ ناکرێت».

ئەم پەیوەندییەی نێوان ئیرۆس/ لۆگۆسە، ڕاستەوخۆی تەعبیر لەو پەیوەندییە دەکات کە لە نێوان شاعیر و شار دا هەیە، پەیوەندی نێوان شیعرییەت و سیاسەت دا هەیە، چونکە بەمانا هەرە قووڵەکەی، ئەکسیۆن ئێستی قەسیدەیەکی سیاسییە، ئەوەی پەیوەندی نێوان ئینسان و دونیا ساغ دەکاتەوە. بەنیسبەت ئیلیتیسەوە، خوداوەندان خەسڵەتی ئێرۆسیان هەیە، ئەفسانەن، ئەگەر بەجۆرێکی دیکەش بڵێین ئەوە لۆگۆس دەگەیەنێ کە بەئێرۆس دەگات. هەر بۆیە لە سروودی ئۆرفێ چاومان بەزیوبسێکی مولتەبیس دەکەوێت، لە هەمان کاتدا مێیە و لە هەمان کاتیشدا نێرە، زیوسێک هەورەتریشقەی ئاوسکپەر و بلاوچە و بارانی پێیە، هەروەها پزسیک و ئاویشی پێیە. کەوتنە خوارەوەی خوداوەندانیش، مەبەست ئەو خوداوەندانەیە کە کریتییەکان باسیان لێوە کرد، ئەمە بەمانای ئەوە دێت کە پەیوەندی نێوان ئینسان و جیهان تووشی کەرت بوون هاتووە و ئەم پەیوەندییەش تەنها هەر سووتووی و فەنای لێوە ئەنجام دەبێت.

لە جیهانی تەکنیکدا، لە هەققەتدا ئێرۆس لە ناو دەچێت و وشەیەک هەر تەنها یەک دەلالەی دەبێت، ئەویش ئاماژەیە بۆ شتێکی ماددی بڕشت دەکات و بەس، توانای خەیاڵکردن نامێنێ کە شاعیر بێ وچان هەوڵی بۆ دەدات، چونکە ئەم خەیاڵکردنە، بەهەشتە و ڕووناکییەکی نا-ماددییە، ئەوەی کە چۆک بە ئەبسورد دەدات. بەبێ کرداری خەیاڵکردن، مرۆڤ بەمرۆڤ ناژمێردرێت، بەتایبەت مەبەست لەو مرۆڤە هارمۆنییەیە کە ئیلیتیس باسی لێوە دەکات کە سەر بەشارستانییەتی مینۆیانە «تاقە شارستانییەتێکە کە شایانی ژیانی هەیە، بەنیسبەت منەوە»، ڕۆژێک ئەمەی لە لا درکاندین.

لەناوچوونی توانای خەیاڵکردن، واتە لە ناوچوونی موجیزە دەگەیەنێ:

جەنگێکی کوشندە شوێنەکەی دەگرێتەوە، لەم ڕووەشەوە، واتە جەنگ و مەرگ، تو ئەکسیۆن ئێستی وانەیەکی زۆر چاکمان لەمەڕ ژیانەوە پێشکەش دەکات.

شاعیر لە ڕێگای ستایشکردنەوە، دەنگ و جێگایەکی پێویست، بەپێی وەزیفەی خۆی، دەبەخشێتە لۆگۆس/ ئێرۆس. مافی هەڵە و خراپە و جیاوازیشمان پێ دەبەخشێ و ئەو نا هاوسەنگییەی کە لە نێوان ژمارەی جووتەوە بەرەو تاک دەچێت، یەکەمیان ئاماژە بۆ خاک دەکات، دووەمیشیان ئاماژە بۆ ئاسمان دەکات، واتە خاکی ئێرۆتیس بوو بەلۆگۆس، ئاوس بوو و منالّی لێوە پەیدا دەبێت.

چونکە بەبێ لۆگۆس، ئێرۆس تەنها ئارەزوویەکی بێ وجوودە. جۆرە «پاڵپێوەنانێکە». هۆکارێکی تەعبیرلێنەکراوە. نا-واتایە. کەواتە پێویستە سێ قۆناغ دەستنیشان بکرێت: لە نا-واتاییەوە کە لە هەمان کاتیش شوێنی ئافراندنە، پێویستە ئێرۆس بچێتە قۆناغی تەجلابوونەوە (سەرەتا ڕووناکییە و...) واتە «کەوتنە سەر زەوی» کە دۆزەخە. کاتێکیش تەجلا بوون هاتە دی، کات و بەردەوامیی پەیدا دەبن، ئەویش بەمشەققەت، ئازار و دژە مەرگ وەستان دەپێورێ، مەرگیش گەڕانەوەیەکە بەرەو پێش ئافراندن. ساتی دووەمیش ئازارە. خەسڵەتی وشەی سیحراوی هەیە، ئەویش ئێرۆسی ئەم جیهانەی ئێمەیە کە دەیەوێ لە ڕێگای زمانەوە پەیوەندی لەگەڵ نادیاری ئەسڵ دروست بکات، دال لە نا- دال دەگەڕێ، بەم گەڕانەشدا، مەدلوول دەدۆزیتەوە، ئەویش شار و یاسایە. چونکە مەدلوول بەمەبەستی کۆد و دەستوور دێت. لێرە مەبەست لە « حەقیقەت هەڵدەچن هەروەکو ئەوەی درۆ هەڵدەچن» (مەریەمی تەمەکان). لەناو ئەو کرداری دژایەتییە ئەخلاقییە، دوو شت دروست دەبن: ئەوەی واتا دروست دەکات و ئەوەی واتا دروست ناکات. ئەمەش دەگاتە ئەو ئاستەی کە بەها، بەهای پیرۆز و یەک لە دوای یەک دروست دەبن، ئەوەی پاداشت دەبەخشێ، نرخ دەبەخشێ و لە دوو تۆی ژمارەکاندا دامەزرێنەری ئەخلاقە،



ئەمە ئەخلاقی چلۆنایەتییە کە لە ناو ئەخلاقی چەندایەتییەوە دێتە بەرهەم. تەواو بەپێچەوانەی کۆمەڵگای ئیمرۆمانەوەیە. چونکە تەنها گرینگی بەژمارە دەدات و چلۆنایەتی هیچ بەهایەکی بۆ نییە. بەم پێیە کۆمەڵی هاوچەرخ دژ بەمەرگ دەجەنگێ بەبێ ئەوەی گرەوی ژیان بەرێتەوە، بۆ ئیجابییەتێکی موتلەق هەوڵ دەدات، بەرەو پۆزەتیفێکی کە نێگەتیفی نەبێ. شتێکی سروشتییە ئەم گرەوە ناباتەوە، چونکە سەرکەوتن تەنها «لە ئێستا»دایە، نەک لە «هەرگیز»: لە «هەرگیز»دا جیهان لە وێرانەدا دەژیت. هەر وەک چۆن ئیلیتیس لە کۆتایی تەهلیلەی سبەینان، ئاماژەی بۆ کردووە. ئەگەر بێت و پیرۆزایی یا ستایشی بۆ مەرگ بکرێت، ببەزێ، تەنها بەهۆی ئەنتیگراسیۆنەوە[10] ئەنجام دەدرێت، واتە ببێتە بەشێک لە ژیان و بەدوا قۆناغی ئازار دەژمێردرێت، مەبەست لەو جیهانەیە کە ئێرۆس بەحزووری لۆگۆسەوە دەگەڕێتەوە:

**لەمە بەدواوە دەستی مەرگە**
**میهرەبانی ژیانمان پێ دەبەخشێ و**
**وەنەوزیش نەما. (کۆتایی ئازار)**

باشە ئەم وەنەوزە چییە؟ ئەمە نووستنی ئینسان دەگەیەنێت لە ناو نا- دال دا. ئەمە هی ئینسان/ ئاژەڵە، ڕوەکییە. ئەمە غیابی هۆشیاریی دەگەیەنێ. دەرچوون لە خەون، یا بەئاگاهاتنەوە، مانای «شفرەکردنی پاکیزە یا بێگەرد» دەگەیەنێ.

بەم شفرەکردنە دەگەینە بەها. ئەمەش لە لایەن شیعرییەتی یاساکانەوە بەرقەرار دەبێت، بەم پێیە دەگەینە ئەو «هێشووانەی کە مەستکەرن»، بەمە ئێرۆس ئامادەی تەواوی هەیە وشەی خەلاق بگرێتە خۆی، خەلاقی بەها.

(١٠) واتە هاوگونجاندنی توخمێک لەناو سیستەمێکی دیاریکراو، بەجۆرێک ئەو توخمە ئیتر ببێتە بەشێکی ئۆرگانیکی لەو سیستەمەکە. (وەرگێڕ).

بەمەش دەگەینە دوا قۆناغ، دروستکردنەوەی بەهەشتی عەردییە: ئەویش کاتێک دێتە دی، لەو حاڵەتەی کە وشەی خەلاقی بەها دێتە کایەوە، بەمانایەکی دیکە، ستایشکردن (تەهلیلە) دێتە ئاراوە و جیهان و ئینسان پێکەوە دەپیرۆزێنێ، چونکە پەیوەندییە هۆشیارییەکانی ئێرۆس خەملێندران و بەسەر هەموو شتە هەستپێکراوەکانا ڕووناکی دەبەخشێ.

گشت ئەم جیهانبینەی ئیلیتیس پەیوەندی بەگنۆسەوە هەیە، واتە بەچەمکی عیرفانییەوە. ئیلیتیس شاعیرێکی عیرفانییە و گەشە بەلۆگۆس دەدات و دەیەوێ لە پلەیەکی زۆر بەرزدا لە لایەن ئینسانەوە تەحقیق بکرێت. شاعیری هەتاوی نا- مەعریفەیە. لەم ڕووەوە لەوە تێدەگەین کە جیهانبینی شاعیر لە هەمان کات یۆنانی و لە هەمان کات جیهانییە، زۆر بەباشی لەگەڵ بۆچوونەکانی سورپالییەکانیش یەک دەگرێتەوە. نیوەی خوێنەرانی یۆنانی ئیلیتیس بەشاعیری نەتەوەیی خۆیان دەزانن و نیوەکەی تریش کە هۆشیارییەکی تەواویان لەمەڕ ڕەگوڕیشەی ڕۆشنبیریی خودی خۆیانەوە نییە، هەڵبەتە ئەمەش بۆ نەتەوەکەی هاوسێش ڕاستە، مەبەست لە فارسە، ئیلیتیس بەشاعیرێکی قورس و گرانی دادەنێن. بۆ ئێمەش، کە تەنها هەر لە ڕێگای فیکرەوە ڕەگوڕیشەمان دەگاتەوە یۆنان، گرفتی بەیۆنانی بوونی شاعیر شتێکمان پێ ناڵێت: هەر خێرا لەوە تێدەگەین کە ئەم شیعرە لەگەڵ خۆیدا، ئەفسوونێکی ئینسانی گەورەی هەڵگرتووە، هەر وەکو ئەوەی گەیشتبینە سەرچاوە.



*

ئەی باشە لەم ڕووەوە، دەبێ فیکری سیاسی ئیلیتیس چ بێت؟ ئەکسیۆن ئێستی کتێبی تاراوگەیە. بەنیسبەت شاعیرەوە، لە سەرەتای قۆناغی دووەمەوە، واتە لە ئەکسیۆن ئێستییەوە، ئیتر هەموو شیعرییەت بەنیسبەت ئەوەوە لە تاراوگە پەیدا دەبێت. جەماوەر لەو کەسە خۆش نابێت کە خۆی لە دەرەوەی شار[١١] دەدۆزێتەوە. بەڵام ئەمیان لەم ڕووەوە تاقە شاعیری ڕاستەقینەیە، ئەگەر بێت ئەم شێکردنەوەی خوارەوە بەرچاو بگرین لەم حەقیقەتە تێدەگەین.

ئێمە باسی «عەدەمێک (دەکەین) کە تەعبیری لێ ناکرێت». ئەم جێگایە، جێگای شاعیرە. دەبێتە بناغەی بارودۆخی شەهوانی بەنیسبەت فەردەوە کە هەمیشە بەعەدەمێک دەچێت کە تەعبیر لێکردنی سەختە، مەبەست لە نا- دالە کە لە دال تەجلای کردووە. کاری ئافراندنی لۆگۆس، کاری تەواوی شاعیر خۆیەتی: کەم تا زۆر پیندازیش هەر هەمان شت دەڵێت، سەرکەوتنە گەورەکان هیج واتایەکیان نابێت ئەگەر بێت و شاعیر باسیان لێوە نەکات. یاسا وجوودی نابێت ئەگەر بێت و شاعیر نەیەت و لە ڕێگای زمانەوە پەیدای نەکات. ئەوەی کە لە وەسف بەدەرە بەرەو وەسفکراو دەچێت، ئا ئەمەیە جەوهەری شیعرییەت. بەڵام خۆ ئەمەش ڕاستە کە ئەم کارە تەنها نەسپێردراوەتە شاعیر: هەمیشە دوو ئینسان لە ناو یەک دەنگدا هەڵدەکەن، هەر وەکو ژۆێ بوسکێ پەنجەنۆمای بۆ کردووە. شاعیر فەردێکی تەنها نییە، هەر چەند با هەندێ جاریش ئەم هەستەی لە لای درووست بێت: هەمیشە لەگەڵ خۆیەتی: هەر وەکو سان جۆن پێرس زۆر بەجوانی وتوویەتی لەگەڵ «هاوڕێتی ئەژنۆکانم» دام.

بەجۆرێکی دیکەش، ئەو، ئەوی ترە کە لەناو شاعیر دایە، هەر وەکو ڕامبۆ کەشفی کرد، ئەو کەسەیە کە شاعیر لەگەڵیدا شیعر دەڵێ؛ دیالۆگی

(١١) لێرە شار بەمانا کۆنەکەی بەکار هاتووە، واتە شار- دەوڵەت. (وەرگێڕ)

دووە لە ناو یەکدا. مادامەکی، دوو فەردیش پێکەوەن، هەرچەندە یەکێکیان تەماوی و ئیحتمالیی بێت، ئەو پەیوەندییە ئاشکرا دەبێت. ئەم پەیوەندییەش ڕەگی سیاسەتە. لە دووەوە دەست پێدەکات و لە دووەوە کۆتاییشی دێت، تەنها هەر ئەو کاتەش کۆتایی دێت کاتێک بڕیار دەدرێت.

لەم دوورییەی سیاسەتەدا کە هەموو پەیوەندییە ئینسانییەکان بەگەردوونی مومکیندا گرێ دەدات، دەگرێتە خۆ؛ لەگەڵ دووریی شیعرییەتدا یەکدەگرنەوە، چونکە شاعیر مەبەستی تەجلابوونی «گشت» (الکل). هەر بۆیە کاتێک ئیلیتیس مومارەسەی خیتابێکی شیعرییەت/ سیاسەت دەکات، ئەوە ئیستیغلالی هەموو ئاستەکان دەکات بەمەرجێ دەستی هۆشیاریان پێبگات. ئەوانەی تەنها هەر ئەتینا بە هی خۆیان دەزانن، ئەوانەی (بەتایبەت) تەنها هەر یۆنان بە هی خۆیان دەزانن، ئەوانەی کە تەنها هەر لە سنووری ئینسان دەمێننەوە، ئیلیتیس بەهی خۆیان نازانن. چونکە ئەو زۆر تەجاوزی یاسا بچکۆلەکانی شار و نیشتیمان و ئینسانییەتی کردووە. ئەمەش ئەوە ناگرێتەوە کە خۆی لە ناو بچووک و گەورە و ناوچە و ئەبەدییەتەوە نەدۆزیتەوە.

ڕاستیشە لەم بۆچوونانەشەوە تەنها تاراوگەی لێوە پەیدا دەبێت. دڵخۆشکەر و غەمگینیشە لە هەمان کات. ئەگەر باسی شار بکەین یا نیشتیمان، کە شوێنی زۆر ئاسایین بۆ سیاسەت، ئەوانەی کە دەقاودەق باسی ئەمانە دەکەن لە چ لایەکی لۆگۆسەوە دەبێ دابنرێن؟ لە لایەن یاسا و ڕێکخراو و دامەزراوەکان و دەستوورەوە. گشت ئەمانە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ناو ئەخلاقی چەند شاعیرێکەوە دروست بوونە. بەڵام خەسڵەتی ئەم یاسایانە ئەوەیە کە بەبێ شۆڕش مومکین نیین بەدەست بهێنرێن، پێکهاتەن لە درووستکردنی پەیوەندییەکانی شارا و یاسا گشتییەکانیشی ئەوەمان پێ دەڵێ کە دەبێ سەرنجی بدرێتێ، ئیتاعە بکرێن و ڕێزی لێ بگیردرێت – هەر وەکو دەستوورەکانی زمانە، جا چ لە سانتاکس (رستەسازی)دا چ



لە مۆرفۆلۆژی دا. شار کۆ یاسایەکی نا ماددی بێ سەیرورە و بێ مێژووە: یا ئەوەی کە ئێمە بەمێژوو ناوزەدی دەکەین دیالۆگی نێوان تاکە کەسەکانی شارە لەگەڵ یاساکانی شاردا، مێژووی هاووڵاتی دەگەڕێتەوە.

ئەم تێکڕاییە توانای وجوودی هەیە. واتاکەی جا چ دروستکراو بێت یا وەرگیراو، دوای ئەوەی دەشیعرێندرێت، لە ناو زماندا دەبێتە پێکهاتەیەکی سیاسەت، واتە هەر هەموو مەدلوولەکان دەگیردرێتەوە و دەبێ ڕێزی لێ بگیرێت و لە گەمەی پەیوەندییە ئینسانییەکاندا بەکار بهێنرێت، ئەویش لە بواری توانا و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیدا: لەکسیک و ڕێزمانی لەگەڵ.

ئەگەر بەجۆرێکی دیکە بیڵێین: تاکەکەس لە ناو مەدلوولەکاندا وجوودی خۆی تەنها وەکو هاووڵاتییەک دەتوانێ مەرجەعییەت بداتە یاسا. یاساش بۆ بگرەوبەردە دانەمەزراوە. لەناو ناڕازیی بوون و ئیحتیجاجی ئێرۆسیشدا، مەرجەعی دان بەیاسا ئەرکە و دەبێتە ماددەی داد و عەدالەت، بێسوود هەوڵی ئەوە دەدات مەدلوولی کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە بگرێت، عەدالەت پێشکەشی کەسێکی دیکە بکات وەک لە هاووڵاتی. چونکە بەنیسبەت بۆچوونی باوی سیاسەتەوە، زات وەکو کائین وجوودی نییە، ئەوەی هەیە هاووڵاتین یا ئەوەتا گوێڕایەڵی یاسان یا ئەوەتا لە دەرەوەی یاسا دان.

ئەوەی لەسەر شاعیر بەندە، ئەوەیە کە شۆڕش بەرپا بکات، یاسا بئافرێنێ چونکە ئەرکی ئەوە. دەبێ ئەوە بەشار بڵێت کە فلانە یاسا کۆنە و لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی ئینسان و زیندەوەر و گەردووندا تەبا نییە. بەرامبەر بەیاسا کۆنەکان، شاعیر ئەوەمان دەهێنێتەوە یاد کە زات وجوودی هەیە و زیندەوەر و گەردوون وجوودیان هەیە. ئا بەم جۆرە لە تەهلیلەی سبەیناندا دەڵێ:

**ڕووەکەی تری پیاوکوژان، ڕوخساری نادیار**
**«بۆ» یەکی بچووک کە بەبێ وەڵام مایەوە**

لەناو مەحکەمە دەنگ دەداتەوە. ئەم بۆیەیە کە تەنها هەر فەرد دەیزانێ، فشاری ئێرۆسە، لەبەر سێبەری ماف وەسفی بۆ نییە، بێ وەسفە بۆ هاوولاتی کە بەواقیع تەجاوزی یاسای کرد و فڕێ درایە دەرەوە، تووڕدرایە دۆزەخ و لە تاراوگە دەژیێت: لە بارودۆخی شیعرییەتدا دەژێ. هەر لەبەر هەمان هۆیە، کە زۆر جار ئیلیتیس شاعیر بەپیاوکوژ دەداتە قەڵەم. بۆ ئەوەی یاساش بگۆڕدرێت، دەبێ سەری هەندێکیان بپەڕێنرێن و تاکو بەهەشت بدرێتەوە بەزمان، دەبێ چەند سیمایەکی زمان تێکبشکێنرێت، هتد.

شاعیر پیاوکوژێکە کە قسان دەکات. بۆیە هەمیشە شاربەدەر دەکرێت. بەلام، پێداویستیشە بەنیسبەت سیاسەتەوە، چونکە بێ شاعیر سیاسەت دەبێتە قاوغێکی هیشک و برینگ کە تیایا «کۆمەڵگای هاوولاتیان» وردە وردە گیان دەدات بەرامبەر بەو «حەمکە زاتانەی» کە لە گەشەکردن دان، پێشکەوتنی ئیلهام و تێڕوانینیان و گۆڕانکاری پێداویستییەکانیانی تەعبیر کردن و مومارەسەکردنی ئیرۆسیان لە جوولە دایە. کەواتە شاعیر بەرامبەر بەسیاسەت لە پەیوەندییەکی دیالیکتیکی دایە، بەلام لەوەش تێدەگەین کە خەمی سیاسەت بەڕێوەبردنی مەدلوولە لەوەوە پێش دروستکراوەکانە، کە یاسا و تەقلید خەملاندوێتی، هەولی ئەوە دەدات کە لەگەڵ پێداویستییەکانی هاوولاتیاندا هارمۆنیزەی بکات و لێرە شاعیر بەدوژمنی خۆی دەزانێ، ئەو کەسەیە کە جەژنی لێ تێکدەدات، وەکو دانە لمێکە کەوتبێتە ناو مەکینەی کۆمەلایەتییەوە. ڕێگرە بەرامبەر بەتەشریع دانان و تەنفیزکردن، شاعیر هەمیشە ئەوەی دەهێنێتەوە یاد کە سیستەمی مەرجەعییەتی کاتییە و کەمبڕە.

باشە شاعیر بەو کەمە دەسەلاتەی کە هەیەتی دەبێ لە کوێی کۆمەڵگاوە دابنرێت؟ ئلیتیس وەلامان دەداتەوە « لە هەموو شوێنێک». چونکە تمووحی شاعیر ئەوەیە کە جەوهەری یاسای کۆسمیک[١٢] پێشکەشی ئینسان

(١٢) کۆسمۆس وشەیەکی یۆنانییە بەواتای گەردوونێکی سیستەمئامێزی زۆر مەحکەم دیت. هەروەها لە فەرەنسی (univers)مان هەیە، کە لە دوو وشە =



بکات – نەک یاسای زانست، کە پەیوەندیی ئەمیان هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئێتیک[١٣]دا نییە – مەبەست لە ئیتۆسە.

شاعیر بەناوی ئێتۆسەوە دەیەوێ یاسای زیندوو، یاسای کۆسمۆس و ئینسان بخاتەڕوو و پێشبینیی[١٤] بکات...

هەر بۆیە زمانی شاعیر هەر وەکو ژیان وایە، ئەویش دوو فاقە و مولتەبیسە. بەها بەنیسبەت ئەوەوە تەنها لەو لەحزەیە گرینگە کە هاوجووت لەگەڵ بووندا دەوەستێت. کە پەیوەندی بەوجوودی ئینسانەوە هەبێت. جا لێرەوەیە دژ بەتمووحەکانی سیاسەت دەوەستێت، ئەو دەیەوێ بەناوی بەرژەوەندی شار– دەولەتەوە قسان بکات و یا ئەوەتا بەناو بەرژەوەندییە شەخسییەکانەوە. «تەشریعکردنێک بەبێ ئەوەی بەرژەوەندی دەسەلاتی تیا بەرچاو گیرابێت بەگەورەترین سەربەستی دەدرێتە قەڵەم» هەر وەکو زۆر بەئاشکرا ئیلیتیس لە شوێنێک ئاماژەی بۆ دەکات.

لەم ڕووەوە کاتێک سەیری شیعرەکانی ئیلیتیس دەکەین: ئەوەمان دەهێنێتەوە یاد کە لە ناو شاردا حزووری دار و درەخت پێداویستییە، واتە حزووری سروشت. ئەمە نەک بۆ ئارایشکردن و ڕۆمانتیکەکردن، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەوەمان بهێنێتەوە یاد کە شاریش دەبێ پەیوەندی لەگەڵ سروشتدا هەبێت، بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیی خۆی کە لە نێوان و ئێکۆسیستەمی زەمین و کۆسمۆس دا هەیە. ئەم پەیوەندییە، بەڕێوەبەرانی شار ( سیاسەتمەداران)

= پێک هاتووە یەکەمیان (uni)یا (unus) واتە یەکە و دووەمیشیان (vers)یا (versus) واتە خولانەوە کە بەمانای گەردوون دیت کە لە یەکەیەک پێکهاتووە و لە هەمان کاتیشدا دەخولێتەوە. (وەرگێڕ).

(١٣) واتە زانستی ئەخلاق و هونەری بەڕێوەبردنی هەڵسوکەوت و ڕەفتار. (وەرگێڕ).

(١٤) لە دەقە فەرەنسییەکە فرمانی(prophétiser) واتە تەنەبوء کردن دانراوە. بەلام بەپێی زانینی ئێمە، لە زمانی کوردی فرمانێکمان نییە تەعبیر لەمە بکات. «پێشبینی»مان هەیە، بەهەر چەندە زۆر لە واتاکە نزیک دەبێتەوە بەلام پڕ بەپێستی نییە. (وەرگێڕ).

سەغڵەت دەکات، بەڵام خۆ ئەوەش دەبینین کە لە یەکێ لە دەقەکانی ئیلیتیس بەناوی «پێشبینی- تەنەبوء» باسی ئەوە دەکات کە سیاسەت دەگاتە چ کارەساتێک و بنەبەستێک ئەگەر بێت و تەنها بەرژەوەندی شار بەرچاو بگرێت و نەڕوانرێتە داهاتووی دوور.

چونکە سیاسەت لەگەڵ مەدلوولە باوەکانا ئیش دەکات، فەرامۆشی هەست و سۆزی زات دەکات کە بەیەکێک لە هەرە تەعبیرە بەتواناکانی ئیرۆس دەزانرێت. لە شیعری ئیلیتیس دا، بەهەست و سۆزێکەوە تەعبیر لە زەوی دەکات، هەر وەکو ئەوەی زەوی خۆشەویست بێت و سەیری زەریاش دەکات وەکو ئەوەی مارینا ببینێ و نیشتیمان وەکو کیژۆڵەیەک دەبینێ کە لە نێو هەموو دێڕە شیعرێکدا قووت دەبێتەوە. ئێمە باسی هەست و سۆزێک دەکەین کە بەدەر بێت لە بەزەیی پێهاتنەوە، ئەمە چمکی «مۆرتالیسم» واتە فەنائی دەخاتە نێو جیهانبینیی خۆیەوە، واتە سەرەتا و کۆتاییەکی هەمیشەییە. ئەم جیهانبینییە جۆرە نزیکییەکی لەگەڵ زەردەشتەکەی نیتشەش هەیە- کاتێک لە قەسیدەی مەریەمی تەمەکان دا، ئیلیتیس باسی ڕۆژئاوگەرییەکی «دێباجەیی[١٥]» دەکات لەسەر زەمین، یەکسەر هەست بەزایەڵەی لە «وڵاتی ڕۆشنبیریی» نیتشەیی بەبەر گوێمانا ڕەت دەبێت.

نیگەران دەبین کاتێک خوێنەرێک خۆی تەسلیمی سۆزۆلکە[١٦] دەکات کاتێک دەبینین بە کە لە «ماری مەرگ» وەکو «بای یەک لە دوای یەک» بەنێو ڕامانە گڤڤەی دێت.

مارێکە بەقەدەر ئەوەی جێی قێزلێهاتنەوەیە. هەندەش هەتوان بەخش و نهێنیگریشە، مارێکە دووفاقەیی فارماکۆنی[١٧]هەیە، ژەهر و هەتوانە لە

(١٥) بەواتای ڕەنگین، بەڵام بێ چێژ. (وەرگێڕ)

(١٦) مەبەست لە سۆزێکی خاووخرچە. (وەرگێڕ).

(١٧) وشەیەکی یۆنانییە کە هەر لەویشەوە فەرماسی واتە دەرمانخانە پەیدابووە، کە دوو ڕەگ، دوو واتا دەگرێتە خۆ، لە هەمان کات دەردە لە هەمان کات هەتوانە. (وەرگێڕ).



هەمان کات، هەر وەکو ئەوەی ژاک دریدا کاتێک لە «دەرمانخانەی ئەفلاتوون» دەکۆڵێتەوە، زۆر بەجوانی باسی لێوە دەکات. ئەگەر پێویستمان بەبەڵگە بێت بۆ ئەوەی فیکری عیرفانی ئیلیتیس یەکئالا بکەینەوە، ئەو دووفاقییەی هێرمێس بەسە کە لە بەرهەمەکانی دایە، بەتایبەتی لە تریسمێژیست[١٨]دا، بۆ ئەوەی ئەم قەناعەتەمان لە لا چەسپ بێت.

سەبارەت بەم دوو فاقییەی کە لە زمانی یۆنانی دا هەیە، بەتایبەت لە زمانی کریتی، پێویستمان بەڕوونکردنەوەی چەند خاڵێک هەیە. ئەوەی هەر خێرا بەخەیاڵمانا دێت، دوو فاقەیی سیکسییە. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە تا چ ڕادەیەک زمانی یۆنانی لە جەوهەردا شیعرییە، واتە چەندێک لە نێو مەدلوولەکانی یاسادا ئۆخژن دەبەخشێتە هاووڵاتیان: دەبینین ئیلیتیس گەلێ ئیشی لەسەر ئەو دووفاقییە سروشتییەی زمانی یۆنانییە کردووە. وشەکان لە مێینەوە بەرەو نێرینە و بەپێچەوانەشەوە بێ وچان لە هاتوچۆ و ئاڵوگۆڕ دان. زمانی یۆنانی زمانێکی ئاندرۆژینە واتە « دوو ڕەگە: بەواتای ئەوەی کە نێر و مێ لە هەمان کاتدا دەگرێتە خۆ» بەڵکو لە شیکلی پیتەکانیش دەبینین بۆ نموونە چەند دەنگێک دووپات دەبنەوە، وەکو: (T, Ω, O , H , E , X , K ,)

هەروەکو ئەوەی لە دووتۆی ڕێنووسدا، ڕۆحی یۆنانی بۆ خۆی دەرچەیەک بدۆزێتەوە و بەرەو بەهەشت بڕوات. سەبارەت بەنیۆلۆژیسم[١٩] لە بواری

(١٨) وشەیەکی یۆنانییە (trismegistos)، (tris) واتە سێ جاران و (megistos) واتە مەزن. ئەم ناوە لە لایەن یۆنانییەکانەوە دراوەتە ثۆت ی خوداوەندی میسرییە کۆنەکان و داهێنەری هونەر. هەروەها نازناوی هێرمسی یۆنانی و مێرکوری ڕۆمانییە. لێرە مەبەست لە هێرمسە زیاتر وەکو ثۆت. (وەرگێڕ)

(١٩) وشەیە کە لە بواری زمانەوانی بەکار دێت، مەبەست لەو وشانەیە کە یا ئەوەتا لە زمانێکی دەچنە زمانێکی دیکەوە، یا ئەوەتا چاکسازیی لە بواری ڕێنووسدا دەکرێت. هەرچەندە تا ڕادەیەکی زۆر زمانی کوردی ناگرێتەوە، چونکە ئێمە لە قۆناغی دروستبووندا دەژین. (وەرگێڕ).

ڕێنووسـدا کـە ئیلیـتـیس بـەکـاری دەهێنێ؛ بەم جـۆرە لە دەوری وشـەیەکی دیاریکراو واتاگەلێکی مشەخۆر کۆ دەکاتەوە، یا دەوڵەمەندکەرن، یا سەیر و سەمەرەن، بەم جۆرە ڕێ لە هەندێک وشە دەگرێ، بەنیسبەت بەو دێڕەی کە لە تەنیشتییەوەیەتی کە زیاد لە پێویست دراماتیکی بێت. ئەگەر بێت لە ژێر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەکـانی فـرۆیدیش بخـویندرێنەوە، مـەبەست لە لاپسووسە[٢٠]، ڕێنووسی ئیلیتیس ئەو بلیمەتانە دروست بووە و لەگەڵ یۆنانی نوێش دەهێنێتـەوە بەرهەم. شتـێکی زۆر ئاڵۆزمـان بۆ دەردەکـەوێ کاتێک دەبینین کە یۆنانییەکان «یا» زۆر دووبارە دەکەنەوە لە بەکارهێنانی یۆنانی نوێدا. بەم شێوەیە کاتێک لەسەر ئیپسیلۆن (ypsilonn) و ئێتا (êta) و ئیۆتای (iota) کۆن نوێ یاری دەکەن، زۆرجار فـۆنەتیکانە یەک دەگرنەوە، واتای زۆر دەبەخشێتە وشەی بەکارهاتوو کە چێژێکی تایبەتی دەبەخشێتە خوێنەری یۆنانی زمان.

لێرە وەرگـێـڕ بەشی تەنهـا هەر شکسـتـیـیـە. ئێـسـتـا کـاتی ئەوەیە کـە خـوێنەری نوێ بۆ «ڕۆحـانیـیـەتی یۆنانی» ئامـادە بکەین. لە ڕاسـتـیـدا یۆنانییەکان میللەتێکن بەسروشت زیرەکێکی شەیتانانەیان هەیە، کۆ-ن هەر وەکو گشت ئەو فرەبۆچوونەیان لە بۆ چمکی دیموکراسی هەیە، بلیمەتن لە قـسـەکـردن و چێـژێکی زۆریان بـۆ شت هەیە، بەبێ ئەوەی ناوەرۆکی تێکسـتـێکیش فـەرامـۆش بکەن. ئێـمـەش کـە چێـژمـان لە خـوێندنەوەی لامارتین، هیگۆ و ڕاول پۆنشۆنێک خەملاوە، هەست دەکەین ئێرۆسی زمان سەغڵەتمان دەکات. هەر لە مێژایە ڕۆڵێکی تایبەتمان بەخشیوەتە ئاکادیمیای فـەرەنسی[٢١]، ئەویـش وەزیفـەی پاسـەوانێکی سـیـاسی مـەدلووله، زمانەکەمان بووەتە زمانێکی کلاسیک و دیبلۆماتیک، چونکە فۆرمۆلەکان

(٢٠) کاتێک قسەکەرێک دەیەوێ شتێک بڵێت، بەبێ ویست لە جیاتی وشەیەک وشەیەکی دیکە بەکار دەهێنێ. (وەرگێڕ).
(٢١) ڕێکخراوێکە وەکو ڕەقیب بەسەر زمانی فەرەنسییەوە. پاسەوانیی زمان دەکات. (وەرگێڕ).



بەبێ زیاد و کـەم ئەوەمـان دەدەنێ کـە دەمـانەوێ. بەڵام، ئەگـەر بێت و بەوردی دوای مـەفـهـوومـی شیـعـرییـەتی ئیلیـتـیس بکەوین، ئەوە کـەشف دەکـەین کـە زمـانێکی وا، سـیـاسـیـانەی ڕووت، لەو بەری شـیـعـرییـەت دادەنرێت. تەنها هەر مەدلووله لیستریژەکانمان دەداتێ، هەرگیز مەدلوولاتی ئافراندراومـان چنگ ناکەوێت. ئەمەش ئەوە ڕوون دەکـاتەوە کە شـاعیـرانی فـەرەنسی هەر لە مـالێـربەوە، تووشی ئیـفلیـجی زمـان هاتوون، ئەگـەر بەراوردیان لەگـەڵ شـاعـیـرانی زەمـانی ڕۆنسـازی مـەزن بکەین. جـا ئەو شاعیرانە هیچ ڕێگایەکیان لە پێشدا نییە، یا ئەوەتا وەکو هیتران دەدوێن و لەمـەشـەوە هیچ شـتـێکی تازە بەرهەم ناهێنن، یا ئەوەتـا دەچنە پاڵ نوێخـوازانەوە بۆ خـۆیان زمـانێک بەبەرهەم دەهێنن هەر وەکـو مـالارمێ و دوای ئەویش چەندینی تر، ئیتر بەشاعیـرانی ئێرمیێتیک و ئاڵۆز و گەلحۆ دادەنرێن.

قودرەتی زمانی یۆنانی لەوەدایە کە بەکەرەسەی کۆن، واتای تازە دروست دەکرێت، هەر وەکو ئەوەی خـانووی نوێ بەبەردی پەرستگا ئەنتیکەکان یا کلێسا بیزەنتییەکان دروست بکرێن. وەرگێڕ بەرامبەر بەم گرفتە دەبێ خۆی ڕوون کـاتەوە. بەتایبەت بەرامبەر بەشیـعـری ئیلیتیس، دەبێ پەنا بەرێتە بەر هەندێ لادان و با هەندێ لە دەستووری زمانیش لا بدەین.

ئەم جومناستیکە زمانەوانییە تاکو بڵێی کارێکی تەندروستە. ئەم جۆرە نووسینە ئەوەمان دەخاتەوە یاد کە حەقیقەتی یەکجارەکی نییە: هەر تەنها مـەدلوولاتی سیاسی هەن کە تەعـبیـر لە پێداویستـییە هەنووکەییـیەکانمان دەکـەن، بەداخـەوە هەندێ جار تەعـبیـر لە کـاتێک دەکـات کـە قـرتاوە یا نەماوە. بەڵام زمانی شیعریی زاتانەشمان تووشی بەقاوغبوون دێت کاتێک لەو نێـوەندە دەنگێکی نوێی شـاعـیـرانە قـووت دەبێـتـەوە و بەکـەرەسـەی نوێـیـەوە دەست دەکـات بەشـیـعـر نووسین. با لاپەڕەی ئەو شـیـعـرانە هەڵبـدەینەوە کـە دەمـێک نیـیـە چاپکراون، ئەوە خـێرا تیـایانە گـوێمـان لە هەناسەی سان جۆن پێرس دەبێت و چاومان بەئیلیپسی (تضمین) حەمیمی

ڕنێ شار و واقیعی ڕۆحانی بۆنفوا و شیکارگری لۆژیکی شیکلی دۆگێ دەکەوێت، با توندوتیژیی هەرزەکارێکی ڕامبۆ ئاسا لەوێ بوەستێت. ئەمە جگە لە کاریگەریی شاعیرانی لەوان کۆنتر.

هەر وەکو ئەوەی کافاڤیس و سێفێریس و سیکێلیۆنێس و یەک دووی تر، تاقە مەرجەعی شیعریی شاعیرە لاوەکانی یۆنان بن. خۆ ئەگەر واش بێت، زمانی یۆنانی ئەو بوارەی بۆ دەڕەخسێنێ کە تایبەتمەندێتی خۆیان بدۆزنەوە. ئەمە ئێمە ناگرێتەوە با لە زمانە ئەنگلۆ ساکسۆنەکانیش وشە و دەستەواژە بخوازین. ئەم کێشەیەش هەر یەکاویەک بەرەو ڕووی تەرجەمەمان دەکاتەوە.

ئەگەر بێت و ئامۆژگاریەکمان بۆ خوێنەر هەبێت، ئەوە ئەوەیە کە با گوێ لەم زمانە بگرێ کە ئێمە فابریکەمان کردووە، لە پێناوی ئەوەی ئیلیتس بلێینەوە بۆ ئەوەی تەرجەمە تەنها نەبێتە کاری وشە لەسەر وشە دانان و بەس، تەنها دەستووری زمان بەڕێوەی بەرێت، بەڵکو وەکو مەشقێکی ئافراندنی شیعرییەتی لێبێت. بۆیە هەر لە زمانی ئیلیتیس دا، بەئەنقەست هەندێ جار سانتاکسی وامان داناوە کە لەگەڵ زیهنییەتی یۆنانییەکانا بگونجێ، هەندێ جاریش دووفاقیمان هێشتۆتەوە، بۆ ئەمەش داواکارین کە خوێنەر بەسەریانا باز نەدات و ساتمەیان لێ نەکات.

*

لەبەشی ئازار، مەبەست لەو شیعرە کورتە بیزەنتییانەیە کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە یا بەرامبەر بەیەکتر دەخوێندرێنەوە. یا ئەو شیعرە درێژانەی کە لازیمەکانیان پێی دەچێ لە هەمان دێڕە شیعرەوە هاتبێ، ئەمەش یەکێ لە تایبەتمەندێتی یۆنانیمان بۆ ساغ دەکاتەوە ئەویش خەسڵەتی ڕۆژهەڵاتیانەیەتی. یۆنان دەکەوێتە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە. ئەوەمان لە یاد دەچێت کە کاریگەری مێدییەکان و فارسەکانیان زۆر لەسەر بوو، گەیشتبووە ئاستێک کە لە هەندێ ناوچە، هەندێ کەس هەبوون



هاونیشتیمانییەتی فارسیان زیاتر بەدڵ بوو وەکو ئەوەی بچنە ژێر ڕکێفی یۆنانەوە. پەیوەندی ڕۆشنفکریش هەڵبەتە لەم بوارەدا، بارستایی خۆی هەیە، ئەویش مەبەست لە پەیوەندی نێوان عیرفانی یۆنانی و عیرفانی مەزدەکییە، ئەمەش دیارە لەمەڕ فیکرەی هەتاوەوە، لەمەڕ ماتماتیک و زانستە باتنییەکانی ژمارەوە، لەمەڕ گای کریتییە و هاوشێوەکەی لە کەش و تەقسەکانی میترا بەرچاو دەکەوێت و لەمەڕ پێکهاتەگەلێکی جەوهەری زۆرەوە کە ڕۆشنبیریی یۆنانی پێکدەهێنێ.

لەم ڕووەوە دەبێ وشەی (Orient) واتە ڕۆژهەڵات، لە قەسیدەی ئیلیتیس لە ژێر ڕۆشنایی فیکری مەزدەکی بخوێندرێتەوە هەر وەکو هینری کۆربان باسی لێوە دەکات. مەبەست لەو ڕۆژهەڵاتەیە کە ڕۆژی فیکری لێوە هەڵدێ، شوێنی هەڵهاتنی سۆفیانەیە، مەبەست لە ڕۆژهەڵاتێکی غەیبی و قوتبییە، جۆرە باکوورێکە کە لە هەموو تێکستەکانی شاعیر شوێنێکە بای باکووری لێوە هەڵدەکات. هەروەها دەشبێ لەم ڕووەوە «ئەو کەسەی لە هەقیقەتدا پێشڕەوی بێگەردی چاخەکان» بخوێندرێتەوە کە لە فیکرەی مەزدەکییەوە زۆر نزیکە یا «باڵی ئەرخەوانی فریشتە» (جوبرائیل، کۆربان، سەرەک فریشتەی ئەرخەوانی). هەر بەهەمان شێوە دەبێ تەماشای ڕەنگیش بکرێت، تەماشای هاوچەشنەکانیان لە جیهانی نادیار بکرێت، بۆ نموونە سەوز خێر و بەرەکەتییە و شینیش ئەبەدییەتە.

ئەو جیهانەی کە شیعرەکانی ئیلیتیسی تیا دەخەملێ، جیهانی نیسبییەتی ئەنیشتاینییە، ئەمەش بەهیچ شێوەیەک جێی گومان نییە. بۆیە نیشتیمانی یۆنان، «ئێرێشتیۆنی باڵندەکان» و «پەرستگا بێگەردەکانی ئاسمان» و «کیژۆڵانەی کە سەردەکەن»، بەشیکلێکی سەیر لە ئاسمانێکی باڵادا لەگەڵ ئەوەی دانتی و سەهرەوەردی یەکیان گرتووە. هەموو شتێک لەم جیهانە بەخاڵێکی بۆچوون و دیدەنیگایەک دەبێ بخوێندرێتەوە.

دەکرێ ئاماژە بۆ سەرچاوەکانی شیعری ئیلیتیس بکرێت، ئەویش ئەو

سەرچاوە کۆنەیە کە بەهیندی-ئەورووپی ناوزەد دەکرێت کە کاتێک برایم شاری ئووری جێهێشت چلێکی نهێنی بەدەستەوە بوو، ئەویش ئاگری زەردەشت و هیراقلیت بوو، حیکمەتی عیسای مولتەبیسە کاتێک لەگەڵ تۆما دەدوێ. هی مەحەمەدە کاتێک لە ژێر چاودێری دەستی ڕاستی خودادا، سوورەتەکان دەڵێتەوە «ئەوەی کە ژمارە شەش و حەوت نەزانێ، ناتوانی تەفسیریان بکات».

خاڤیە بورد



## ئافراندن

سەرەتا ڕووناکییە و کاتی یەکەمیشە
هێشتا قوڕ بوون
لێوان
بۆ تاقی کردنەوەی شتانی گەردوون دەخەملان
خوێن زومەڕەد و فیسقەی زەمینی زێڕین.
ئەفسوونی باڵا لە وەنەوزی دا زەریای مەزنیش ڕادەخات،
پەڕۆی شاشی ئەتیر، ئەم پەچە خاوانە
لە ژێریی خڕنووک پێدەگات و هەروەها فوارە مەزنەکانی دارخورما چڕەکانیش.
لەوێندەرێ بەتەنها تووشی
گەردوون هاتم
بێوچان هەنسکی دەدا.
ڕۆحی *پەشۆکاوم لە ئێرو و تیمۆنیێ دەگەڕا.*
ئەو کات بینیمن، دێنەوە یادم
سێ ژنە گەورە ڕەشەکە
خەریکی بەرز کردنەوەی بازووەکانیان بوون بەرەو ڕۆژهەڵات.
پشتیان بەزێڕ نەخشراو و ئەو هەورەی کە وردە وردە
جێیان دەهێشت تەڵخ هەڵدەگەڕا
بەرەو لای ڕاست، نامیش
لە شێوەی جوداوازا.
هەتاو بوون، وێڕای تەوەری خۆی لە ناو چەقی من دا بوو

هەموو بەدووپات کردنەوەی تیشک کە بانگاشەی دەکرد، پاشان بوومە
ئەو کەسەی لە هەققەتدا پێشڕەوی بێگەردی چاخەکان.
لاسکی هەمیشە لە خەرمانەی ئاگرین، نمامی نەپچڕاوی ئاسمان.
هەستم کرد دەهات و بەسەر
بێشکەی من دا دەچەمایەوە
هەر وەکو ئێستا بێت زاکیرەی تەڵخی
دەنگێک لە دارستان و شەپۆلان بخوازێ:
«وتی: پەیامی تۆ
ئەم گەردوونەیە
چونکە لە قووڵایی هەناوی تۆدا
نەخشراوە.
خۆت فێرکە و ڕەنج بدە
بجەنگە»
پێی وتم:
«هەر کەسەو بەگوێرەی چەک و تفاقی خۆی» پێی وتم:
پاشان دەستەکانی یەکئالا کردەوە وەکو چۆن لاوێک
بەتەمای عەرشی خودا بێت، بۆ ئەوەی پێکڕا
ئازار و لەززەت بتاشین.
سەرەتا بەهێزێکی زۆرەوە
لە هەرە سەرووی کوونی بورجە شەق بردووەکاندا
هەر «حەوت تەورەکەمان» خستە خوارەوە
با هەر وەکو ڕەشەبا بێت
کاتێک هێور بووبێتەوە
کە باڵندەیەک عەتری



سەرەتاکان پەخشو بڵاو دەکاتەوە
خوێن پاگژ بوو گەیشتەوە نیشتمان و
هێدی هێدی دڕندەکان شێوەی ئینسانیان وەردەگرت
ئەو شتەی کە لێی تێناگەین
چەند ئاشکرا دەچێتەوە.
پاشان بای خێزانەکەمیش هاتن
پێشڕەوی زارۆڵە پەیامبەرە ڕوومەت خرپنەکان
بەخۆیان و کلکە فراوانەکانیانەوە کە بە هی گۆرگۆنەکان دەچوون و
پیرەمێردەکانی دیش
حیکمەتە کۆنەکان
پێستی پوولەکەدار ڕیش بە هەیبەت.
بەهۆی ئەوان هەوریش بوو بە دوو کەرتەوە پاشان بوو بە چوار
کەرتەوە
ئەو کەمەشی کە مابووەوە فوویان لێکرد و حەواڵەی باکووریان کرد.
بەهەنگاوێکی پتەوەوە ڕۆ چووە نێو ئاوەکان، بەفیزێکیشەوە،
دۆنژۆنە مەزنەکە.
هێڵی ئاسۆ درەوشایەوە
ئاشکرا بەڵام چڕ بەڵام تێپەڕ ناکرێت

بەکورتی
سروودەکانی یەکەمە.

بوومە ئەو کەسەی کە لە حەققەتدا پێشڕەوی بێگەری چاخەکان بوو،
لاسکی هەمیشە کەسک لە خەرمانەی ئاگرین،
خاڵێکە بەدەستی
مرۆڤ تاشراوە

بەقامکی دۆشاومژە
لە نێو ماوەدا
ئەو هێڵانەی کێشا
کە جار بەجار، زۆر بەتوندی هەڵدەزنان بەرەو بەرزاییەکان و
هەندێ جاریش بەرەو تەپۆڵکە خاوەکان یەک بۆ ناو ئەویتر خاو دەبوونەوە
هەستم کرد بۆنوبەرامەی زەمینی کێشوەرە فراوانەکان
هەر لە بۆنوبەرامەی ڕۆح دەچن.
حەقیقەت هەندە بەهێز بوو
ملکەچ شوێنپێی هەڵدەگرتم
زەمین
لە نێو لۆچە نهێنییەکانیدا لە قرمزی زیاتری کۆ دەکردەوە و
هەروەها گشت گەندەمووە ناسکەکانی دەرزیلەیی سنۆبەر
پاشان لەو دیویش خەواڵووتر بوون
گردەکان تەپۆڵکە ناسکەکان
بەڵام لە شوێنەکانی دی دەست لە دۆڵ و دەشتاییەکاندا
بەخاوی دەحەسێنەوە و
لە پرێکیشدا گابەردە سەخت و ڕووتەکان
بەرهەمی حافیزی گەلێ چڕ.



بۆ چرکەیەک بەحەپەساوی چاوەڕوانی پێگەیشتنی
چەند شتێکی هیشک و برینگ دەکات
یا هی شتێکی زۆر گرینگ
ئۆلەمپ لێرەیە، لەوێش تایژێتە
وتی «چەند شتێک بۆ تۆ
وەکو یاریدەدەرە
هەر چەندە تۆش مردبێتی».
پاشان بەدەوری گابەردەکەدا دەزووڵەی بەست و
لە ناخی زەمینیشەوە قایەی شین بەرز بوونەوە سەر
گشت قەبرغەی بەرزایی ئەو دەورووبەرە،
هەنگاوی زەبەلاحی هەڵنا.
لەوێندەرێ بەتەنها
حەوزی سپی مەرمەڕینی سازاند و
ئاسیاوی پەروانەدار گومەزی پەمەیی و
ناسک و کوونە کۆتری هێلانە سپییە
بەرزەکانی بورج
*فەزیلەی چوار گۆشە لە ناو دڵی چوار سووچە ڕێکەکانی.*
دوا بەدوای ئەمە خەیاڵی ئەوەی کرد کە شتێکی سەرسوڕێنەر دەبێت
لە ئامێزی یەکتردا خۆ گرمۆڵەدان و
حەوزە زلە میهرەبانەکانیش پڕ لە ئەڤین بکرێن
ئاژەڵە ساوێلکەکان بەسەریا بچەمێننەوە
مانگا و گۆلکی بچکۆڵە
هەر وەکو ئەوەی لە جیهاندا تاقە تەڵەیەکیش نەبێت و
هێشتاش بریقانەوەی چەقۆش نەبینرابێت.

وتی «بۆ تەحەمولکردنی ئاشتیش هێزمان پێویستە»
بەدەوری خۆی خولێکی خواردەوە پڕ بە چنگیش
تۆوی بە بەرەکەتی وەشاند
بۆیۆن – بڵاَن و زەعفەران و کامپانوول و
هەموو جۆرە ئەستێرەیەکی زەمینی چاند
لەسەر گەڵاکانیشیان کوونێکی کرد بۆ ئەوەی
ئاماژە بۆ ئەو شوێنە بکات کە لێوەی هاتووە
کە هێز و مەزنییە

بەکورتی
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!



بەڵام ناڕۆم بۆ
گوێگرتنی شەماڵ و مۆسیقا
تەنها ئەگەر بۆ پێگەیشتن خرۆشاوی ڕێگایەکی
سەربەست نەبم

(بەسەر تەپۆلکەیەک سەردەکەوتم و خۆ تەواویش نەدەبوو
بەپاژنەشم شوێنەوارەکانی مێژووم دەسڕییەوە)
ماوەیەکی زۆر لە نێو چەرچەفەکان گینگڵم دەدا، ئەو شتەی لێی دەگەڕام
تێکڕاییەکی بێتاوان بوو، وەکو گەڵامێو هەڵدەلەرزی و قووڵیش بوو
هەر وەکو ڕووەکەی تری ئاسمان بێ چرچ و لۆچ
*چەند غەمزەیەکی ڕۆح لە ناو دڵی کەڕووی قەد قورەسوور*
ئەوکات وتی زەریا و
زەریا پەیا بوو
بە سترانە هەمە چەشنەکانییەوە
بینیم و بووم بە شینایی
لە ناویشی جیهانی وردیلەی چاند مینا وێنەی من و هاوچەشنی من:

ئەسپە هیشک هەڵگەڕاوە یاڵ درژەکان
لە ناویانا گۆزەکان بەهێمنی دەنوون
پشتی دۆلفینە قۆقزەکان و
ئیۆس و سکینۆس و سێریفۆس و میلۆس
وتی «با لە هەر وشەیەکەوە پەرەسێلکەیەک دەرپەڕێ
بێت و بەهارت لە ناو دڵی هاوین بۆ سازکات».

دار زەیتوونێکی زۆریش
بەباسکەکانیان ڕووناکی خاوێن دەکەنەوە
بۆ ئەوەی بەبێ هەست باران ببارێتە سەر وەنەوزت و
زیگزیکەی زۆریش
کە سەرنجی نادرێتێ
هەر وەک چۆن سەرنجی ترپەترپی لێدانی خوێنبەری
مەچەکی ناکرێت
بەڵام بەپێچەوانەوەش ئاوێکی زۆر کەم
بۆت دەبێتە خوداوەند و خۆتیش ڕادەهێنێ
بەو واتایەی کە ئەو دەیڵێ و
درەختیش لە خەڵوەتی خۆیدا
لەبەر ئەوەی بێ هاوچووە
تۆ بیکە بەهاوڕێی خۆت و
نرخی ناسکی ناوەکەشی پێ بزانە
ناسکیی لە ژێر پێیە لیتاوییەکەت
با نەتبێت لەو شوێنەی کە ڕەگەکان پەرت و بڵاو
دەبنەوە و
کەواتە قووڵتر ڕۆ بچۆ
لە بەرزاییش تا چاو بڕ دەکات ئاسمان
هەر بەخۆت بێگەردیی هەتاهەتایی بخوێنەوە

بەکورتی
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!



«چونکە ئەم گەردوونە پێویست دەکات سەرنجی بدەیتێ و ئاوێتەی ببیت»
وتی: تەماشا کە! «لە چاوانیشمەوە تۆویان بەرەو دوور
وەشان خێراتر لە بارانی هەزارەها دۆنم زەوی کە هەرگیز باران
نەباریوەتە سەری
پزیسک لە ناو تاریکیی ڕەگیان ڕۆ دەچوو و لە پڕێکیشدا ئاوی
بێوچان هەڵدەقوڵێت.
لە ناو بێدەنگی دەمکێڵا
بۆ ئەوەی تۆوی دەنگ بوەشێنم و
تۆوی زێڕینی غەیبزان.
دەسکی بێڵەکەم هێشتا لە نێو دەست دایە
مەزن بوون ڕووەکە قاچ کورتەکانم ببینی،
کە بەرەو من ڕوخساریان گڕ دەدا
هەندێکیان بەحەپەحەپ و هەندێکیشیان زمانیان بۆ دەردەهێنام:
لەوێ ڕوەکی فریشتەیی و لێرەش شبیت
لەو تەنیشتە کەرەویزی قژ لوول
مێخەکی سیلیک و بازیلیک
کودی و تاڵێشک.
*لە ناو کتێبی ئەلف و بێی نهێنی ناسنامەکەم* حینجە کرد
«پێی وتم ئافەرین و ئێستاش کە وا فێری خوێندنەوە بوویتە
پێویستە زۆر بخوێنی
بۆ ئەوەی بتوانی ڕۆ بچیتە نێو نا-واتاوە
ڕۆژێکیش دێ لایەنگیر بۆ خۆت پەیدا دەکەیت
ئەمە بهێنەوە یادت:

شنه چەکی سپی لە دەست
هەناری سێبەر کوژ
ماچی ئاگر گری
پێ سووک».
وشەکەشی هەر وەکو عەتر بڵاو بووەوە.
لە کاژێری نۆیەمدا لە پڕێکدا کەوەکە
کەوتە ناو قووڵایی نەغمەوە
بە هاوجووت کردنی خانووەکان
هەموو لە ناو یەک گرت بوونەوە
بچکۆڵانە و شەش پاڵوو
بەهەیوانە سپییە کەوانییەکان و
دەرگا شینەکانیان.
لەوێندەرێ بەژێر کەپری میوەکاندا گوزەرم کرد
بەسەعات لە نێو هەزارەها نەغمەی
بلوێردا داڵغەم لێ دەدا
لە نێو قیرە قیری بۆق و زیکەزیکی سیسارک و
لە دوورەوەش دەنگی واقواق:
لەوێندەرێ سۆنە و لێرەش دارکونکەرە
لەوێندەرێ کووکوختی
ریشۆڵەی گەڕۆک و فیسقەی شەیدا
زەردەواڵەشی لێ بوو
هەروەها ئەسپێکی چکۆڵانەش کە «عەزرای» پێ دەڵێن.
*کەنار و ڕانە رووتەکانم لەبەر هەتاو*
پاشانیش زەریا و زەریایەکی تر و



سێیەمیشیان لە نێوەند – دارپرتەقاڵ و دار لیمۆ و دار لالەنگی
ئەوەی تریش بای باکوور کە ملکەچی باکانی دەربەندە
کە شینایی ئاسمان تەڵخ دەکەن.
لە خوارەوەش لە ژێر تاق گەڵا فەرشە
بەرد ئەم نێچیرە لووسە
پەڕە نەرمەکانی گوڵ و
رووەکە ناسکە نەوجەوان بێ ئارام شین دەبن
بەکورتی
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!

پاشان ناسیم و ڕندەی شەپۆڵ و بێکۆتایی
مووچڕکە دوورەکانی چەنگەڵان
لەسەر کۆرنیشە ڕاخراوەکان
ریزە گۆزەی سووری لە سەر لا کەوتووم بینی و
نزیکی سووچەکەی پەنجەرە دارینەکە.
لەوێ لەسەر قەبرغە دەنووستم
بای باکووریش زۆر بەهێز لەگەڵ خۆی دەدوا و
هەروەها بینیم.
کۆرێسەکان تا بلێیی جوان و ڕووت و لووس هەر وەکو چەوی دەریا
کە تاڵە گومانی سیا لە گۆشەی سمتی دا و
تابلێیی تێروتەسەڵ و گێژبوون لە نێو شانەکانیاندا
کە بەڕاوەستاوی لە نێو
سەدەفە ئەفسوونبەخشەکەی
فیکەی دەکرد و ئەوانی دیش
بە تەباشیر خەریکی نووسینی
سیغەی غەریب و تەلیسماوی بوون:
ڕۆز، ڤێنتێریم، ئەریمنا
لۆسەی، مایلمیتۆر، یەلتیس
دەنگە کزەکانی
باڵندە و سەنبولەکان
یا ئەو وردیلانەی کە تایبەت بەگەلاوێژن.
سەعاتیش یانزەی تەواوی لێ دەدا
پێنج گەز لە ژێر ئاو
سوورە ماسی و سارگەکان



بەگوێچکەی زلەوە و کلکی کورت چەشنی پاشکۆی کەشتی هۆنرابوونەوە
لە کاتی سەرکەوتندا ئیسفەنجی
ئەستێرەی زەریام بینی و
گوڵیلکە ناسکە بێدەنگەکانم بینی و
ژوورتر بەرەو ڕووگرژیی ئاو
بازنەی نەسرینی ڕەنگینم بینی
سەدەفە دەمکراوەکان و
قەوزەم بینی
پێی وتم «وشەی بەنرخ و سوێندێکی کۆن کە
زەمەنی ئاهەنگ پارێزگاری کردووە
بەهۆی گوێی سووکی بایە دوورەکان».
لە نزیک ئەو سووچەی کە
پەنجەرە دارینەکەی لێ بوو
هەر لەوێ لە سەر قەبرغە دەنووستم
بەهێز لەسەر سک دەنووستم
بالیفەکەم توند دەگرت بەخۆوە
لە چاوانیشەوە ئەسرینی ئاگرین
چۆڕەی دەهات.
لە شەشەمین مانگی ئەفینم بوو و
لە هەناویشمەوە تۆوێکی بەهادار چەکەرەی دەکرد

بەکورتی
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!

وتی «بەڵام سەرەتا تۆ بیابان دەبینی و
هۆشیاری تایبەتی خۆتی پێ دەبەخشی».
«هەر لە سەرەتادا دڵت لەوێندەرێ بوو
دواجاریش هەر لەوێ دەبێ، هاوڕێیەتیت دەکات.
هەر بەلایەن کەم دەبێ ئەمە بزانی:
هەر شتێک کە بەهۆی برووسکەوە قوتاری بێت
بیگەردی خۆی بۆ هەتا هەتا دەپارێزێ»
زۆر بەرزتریش، لە سەرووی شەپۆڵە بەرزەکان
ئاواییە بەردینەکانی بووژاندەوە.
لەوێندەرێ گوڵی زەریا
وەکو غوبار گەیشتە کەنار
دەغەزار بزنێکی لاتەریک
درزەکانی دەلێستەوە.
چاوە قۆقزییەکەیم بینی و ئەو کەمە پوولەکەیەی کە هەیبوو
لە بەردی کوارتز ڕەقتر بوو
لەگەڵ کوللە ژیام لەگەڵ تینووە تیژەکەیان ژیام،
جیرەی ئەندامەکانی لە نێو قامک.
لە ماوەی ئەو کاتانەی کە مەعریفە تیایا تۆمار دەکرا.
چەمابوومەوە سەر کاغەز و سەر پەرتووکی پڕ لە لوغزی گیر
بەدرێژایی گوریسێکی گرژ بووە
شەوگار و شەوگار دەهاتمە خوارەوە
سپی-تا دوا فشاری دڵ لە ناو ڕەشاییدا بەدووی دەگەڕام
هیوا تا بریسکانەوەی ڕۆندک.
دڵخۆشی تا تخووبی جەخار



بۆ ئەوەی یارمەتیم دات، ساتەوەخت خۆی تەیار دا و
سیحریش لە باران کرا
بەو هەموو ڕۆژگارە
جۆگەلان خۆڕەیان دەهات
وەکو دێوانە غارم دەدا
لە لێوارەکانیشا بنچکە بنێشت و چەپکە گوڵەڕێحانەم دەڕنی
پڕ بە ناو لەپێشم دەمدانە بایە تووش ئیلهام هاتووەکان
بۆ ئەوەی بلەوەڕن.
وتی «بێگوناهێکی بێگەرد وا لە قەدپاڵەکانا و
هەروەکو لە ناختیش بێت».
پاشان دەستەکانی وەک حەکیمێ درێژ کرد،
وەک چۆن خوداوەندێکی کۆنیش دەیکرد
بۆ ئەوەی پێکڕا قوری قاوەیی و شینیی ئاسمان
چێ بکەین.
هەر بۆ هەندەک تەپۆلکەکانی سوور هەڵگەڕاند
بەڵام لە دۆڵەکاندا سەوز دەچێتەوە بێ گڕنی گڕنی
ئەو گیایانەی کە چاندی
پونگە و گوڵەشوانە و لالە
دوو وردە شوێنپێی بەرخۆڵە
یا لە شوێنانی دی لە بەرزاییەکانەوە بەخاوی
دارلیفەی کاڵە زیوینەکان شۆڕ دەبنەوە، پرچی فێنکی کیژۆڵەیەک
کە بینیم و حەزم تێی چوو.
ژنێک لە گۆشت و ئێسقان.
وتی «بێگوناهێکی بێگەرد، ئا ئەوەتا»

پڕ گیان جۆشو خرۆشێکی گڕگرتوو، نەوازشم
لەگەڵ ئەو لەشە دەکرد دەم لە ناو دەم؛ پاشان یەک
رۆ چووە نا قووڵایی ئەوی ترەوە
چ ڕەشەبایەک
پاشان هەر وەک زمانەی زەریا وەرچەرخام
لە ئەشکەوتان دوور تر
بە با دەئاوسان.
زایەڵە بە سەندالی چەرمگەوە وەکو هەورە تریشقە تێپەڕی
لە ژێر شەپۆڵ فرتەی هات و ئۆرفی ڕووناک کردەوە
سەرووتریش گردەکان بۆ پێ و
بۆ سەری قۆچداریش هەتاو ئارایش.
کەهەنوتییەکی هەڵشاخاو بەرانە گەورەکەم بینی چۆن بەرز دەبووەوە.
بوومە ئەو کەسەی کە لە هەققەتدا پێشڕەوی بێگەردی چاخەکان.
لاسکی هەمیشە کەسک لە خەرمانەی ئاگرین، نمامی نەپچڕاوی
ئاسمان.
کاتێ پرسیارم لێی کرد بەچرپە چرپ وەڵامی دامەوە:
- باشە چییە؟ خراپە چییە؟
- خاڵی دەسپێکردن هەمان خاڵی کۆتاییە
لە سەر ئەم خاڵە تۆ هاوسەنگی و لە وجوودی و
لەو دیو ئەو خاڵە پاشاگەردانیی و تاریکستانە و
لەمدیو ئەو خاڵەش خەم و دانجیرکردنەوەی فریشتانە
- خاڵی دەسپێکردن هەمان خاڵی کۆتاییە
لە ناو ئەو دا بۆ هەتا هەتا دەتوانی بەرەو پێشەوە برۆی
لەمەش بترازێ هیچی دیکە وجوودی نییە



تەرازووش کە بە فراوانی لە نێو بازوومدا دەکرایەوە،
پێی دەچوو بەرامبەر بەغەریزە ڕووناکی ببێوێ، ئەمە بوو
بەکورتی
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!

له بەر ئەوەی سەعاتەکان وەکو ڕۆژگار بەگوێرەی
گەلا پانە وەنەوشییەکانی پەرژینی باخچەکە دەخوولانەوە.
من میلەکەی بووم
سێشەمە چوارشەمە پێنجشەممە
پووشپەڕ و گەلاوێژ و خەرمانان.
ئەو پێداویستییەم درکاند کە پێویستم بەئاوی خوێاوە
بڕژێتە سەر ڕوخسارم، پێشوولەی تیسکنی کچان.
بلاچە دوورەکانی ئیریسی ڕۆشن –
پێی وتم «گشت ئەمانە لە کاتی
بەرائەتدا دەردەپەڕن
لە کاتی تولە گورگ و
لە کاتی دەوەنی پاراودا
زۆر لە پێش سەرهەڵدانی پێداویستیی».
بەنووکی پەنجە ترسناکی دوور خستەوە.
لەسەر تەوقی سەریشدا برژانگێکی ڕەشی دانا.
لە جێگایەکی نەناسراویش وای کرد فسفۆر داچۆڕێ
وتی «بۆ ئەوەی ببینی، لە ناوەند
جەستەی بەپۆتاسیۆم موولوولە ڕێژکراو و
مەنگەنیز و کلسی دیکە، بەتوندی شوێنەواری عیشقیان
لەسەر هەڵکۆڵییەوە».
بەم وشانە دڵم زۆر بەتوندوتیژیی تەنگ بوو.
ئەمە یەکەمین ڕمانی دارستان بوو تیاما.
هی شەوێکی نزیک، ڕەنگبێ هی هەنگاوێکی فێلاوی بێت
قیرەی ناخۆشی کووندەبوو



هی یەکێک کە قەدەرێکە کوژراوە
وا خوێنەکەی دەگەڕێتەوە
بەسەر جیهانا ڕادەخرێت.
لە دوور ڕا، لە دوا تخووبەکانی ڕۆحمدا بینیم
نهێنییەکی نا ماددی شۆڕ بووەوە
فەنارە بەرزەکانی دێهات، قەلا بەڕووی خەرەندا چەسپ کراو
ئەستێرەی باکوور، مارینای پیرۆز و گەلە شەیتان.
گەلێ زیاتریش بەرەو قوولایی لە پشت شەپۆلەکان.
لەسەر ئەو دوورگەیەی کە لێوارەکانی بەدارزەیتوونەکان دەلەرێنەوە.
لە ساتەوەختێکدا هەستم بەوە کرد لەو کەسە ڕامام کە
خوێنی خۆی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی من شێوە وەرگرم
بەڕێگای سەختی پڕ ئازاری پیر سەردەکەوت و
جارێکی تر و
ئینجاش هەر جارێکی تر
کەوتە سەر ئاوەکانی ئێرا و ئا ئەوەتا بەئەنگوستەکانی
هەر پێنج گوندەکەش داگیرساند
ئا ئەوەتا پاپادۆسو ئا ئەوەتا پلاکادۆس
ئا ئەوەتا پالیۆکۆدۆس
ئا ئەوەتا سکۆپێلۆس و ئا ئەوەتا مێساگرۆس
شوێن و مۆڵگەی ڕەگەزی خۆم.
وتی «بەلام ئێستا، پێویستە ڕووی دووەمی تۆ
بەرەو ڕووناکی بەرز بێتەوە».
پێش ئەوەی لە فیکرمدا
نیشانەیەکی ئاگرین یا شێوەی گۆڕێک دروست کەم.

ڕێک و ڕاست کەوتە خوارەوە
کەس نەیتوانی ببینێ
دەست بەرەو پێشی شۆڕبۆتەوە و
چەماوە
بەتاڵییە مەزنەکانی پەروەردە کرد
لەسەر زەمین و
هەروەها لە جەستەی مرۆڤ:
بەتاڵی مەرگ بۆ لە دایکبوونی کتوپڕی زارۆک.
بەتاڵی پیاوکوشتن بۆ یەکسانی داد.
بەتاڵی قوربانی بۆ پاداشتی تەواو.
بەتاڵی ڕۆح بۆ گرتنە ئەستۆی ئەوی تر.
شەویش بیرکردنەوەی وەنەوشەیی
پیرەمێردە.
شەوق و سۆز
خەرمانەی مانگی لەتوپەت کردوو.
وێڕای ئاسیاوێکی جێهێڵراو، کەلاوەکان و میهرەبانییەکیش
بۆنی قەرسەقوولی هەبێت
لە ناو گیانی مندا جێی خۆیان کردەوە.
ڕێژەی خەتی ڕوخسارەکانی گۆڕی، بارستاییەکانی بەجۆرێکی دیکە
بەشـێـیـەوە، جـەسـتـەی ڕەق و پـتـەوم لـەنگەرێک بوو بـەرەو مـرۆڤ
شۆڕدەبووەوە، لێرە
گوێمان لە هەرای دیکە نابێت
جگە لە زرمەی گریان و لالانەوە نەبێت
جگە لە درزی دەم هەراشی پشت شتەکان نەبێت.



*دەبێ لە چ ڕەگەزێکی نەبوو بێت بنچکی من*
تەنها هەر ئەو کات تێگەیشتم
کە هۆشیاری بۆ ئەویتر
وەک شووشەی تیژ شت کەرت دەکات و
هەر بەڕاوەستاویش لەت و پەتم دەکات.
لە ماڵەکانیشدا شتم هەندە ڕوون دەبینی
هەر وەکو ئەوەی دیوار چییە لێی نەبێت
گەرچک لە دەست پیرەژنەکان عەوداڵ بوو
لە سەر تەوێڵیان لۆچ بە قەد
چرچولۆچی بنمیچ وابوون
لاوە ڕەشتاڵەکانی دیش، چەک لە پژدێن
دانجیر
دوو بەتالیۆنیش سەدەهای ساڵە
دەست لەسەر پالاپیتکە
وتی «دەبینی، هیتران هەن و
ئەمەش مومکین نییە – هیتران بەبێ تۆ و
ئەمەش مومکین نییە – بەبێ هیتران، تۆ
تۆ دەبینی، وتی، هیتران هەن.
دەبێ بەبێ ئەوەی هەست بەلاوازیی بکەیت
دەبێ تەماشای ڕوخساریان بکەیت
ئەگەر ویستت ئاگاداری ئەوە بیت ئادگارەکانت نەسڕێنەوە و
بۆ ئەوەی بشمێننەوە.
لە ڕاستیدا، زۆرن ئەوانەی کە کراسی ڕەش لەبەر دەکەن و
ئەوانەی قسەی هەڵەق و بەلەق دەکەن وەک بەرازی هیندوستانی

هەن ئەوانەی کە شتی خاو دەخۆن قینیان لە ئاوە
ئەوانەی ڕقیان لە نانە و لە ناو کینە سەوز بوونە و
سیسارکە کەچەڵە نوێیەکان
تاجەگوڵینە و لقی خاچی تێتراکتیسی
ئارایش داوە.
ئەگەر بەڕاستی دەتوانی خۆت بەهێز نیشان بدەیت و ڕووی خۆتیان
پێ نیشان بدەیت، وتی
ژیانت تیژبی ڕمی دەبێ و ڕێگاکانت بۆ دەکرێنەوە، وتی
هەر کەسەو بەگوێرەی چەک و تفاقی خۆی» ، وتی
بوومە ئەو کەسەی کە لە هەققەتدا پێشڕەوی بێگەردی چاخەکان
لاسکی هەمیشە کەسک لە خەرمانەی ئاگرین، نمامی نەپچڕاوی
ئاسمان
خۆی خستە ناومەوە و
بوو بەو کەسەی کە منم.
سەعات سێی بەیانی
لەسەر ئۆردووگا دوورەکاندا
قووقەی یەکەم کەڵەباب هەڵسا
لە سووچە بەرزەکاندا لە ساتەوەختێکدا ستوونەکانم بینی
هەنییەی بالاخانە ئاژەڵی پتەون و
عەیب دەبەخشنە ئینسان
هەتاو لێپرسراویی خۆی لە ئەستۆ گرت سەرداری فریشتەش هەمیشە لە
لای ڕاستم
بە کورتی
کەواتە ئەو منە و
گەردوون، تەنک و ڕۆچوونیشی سەخت!



I

کەواتە ئا ئەمەتا ئەو مرۆڤەی کە منم:
بۆ ناسکۆڵەکانی کۆرێس و دوورگەکانی ئیجە پەیدا بوو؛
عاشقی نەزوەی تۆڵەقاسکی کەڵەکێویان
سالیکی گەڵا وردیلەکانی دارزەیتوون بووم؛
خۆرەوەی[١] هەتاو بکوژی کوللە.
ئا ئەوەتانێ لە پرێکدا تووڕ هەڵدرامە بەردەم
جلوبەرگی غەمگین و عەنتیکە و ڕەشی توندڕەوانەی کە بۆ هیچ
ناشێن
تووڕهەڵدرامە بەر سکی بەتاڵی ساڵان، کە خاوەن مناڵی لە بارچووە،
شووی بەتووڕەیی هەموو کینێ کردووە!
با توخمەکان لێکدەترازێنێ و هەورە تریشقەش هێرش دەباتە سەر چیا.
ئەستێرەی بێگوناهان، ئا ئەمەتا بەتەنها بەرامبەر بەدەربەندان!
بەرامبەر بەدەربەندان دەستەکانم دەکەمەوە
بەرامبەر بەدەربەندان بارگەی دەستم هەڵدەخەم و
نە زەنگینی دیکەم بینی، نە زەنگینی دیکەی چاوەڕوانکراو
تەنها لە پاش سەرماوسۆڵەی ڕێڕەوی سێلاوەکان نەبێت
هەنار و شنەی با و ڕامووسان.
دەموت، هەر کەسەو بەگوێرەی چەکەکانی
بەرامبەر بەدەربەندان هەنارەکان شەق دەکەم
بەرامبەر بەدەربەندان لە کاتی پاسەوانییدا شنە بەرەڵا دەکەم
پێش ویش، ماچە مێژینەکان دەهاوێژم کە ئارەزووم پیرۆزی کردووە!

(١) ئیسمی فاعیل بۆ چاوگی «ئاوخواردنەوە». (وەرگێڕ).

با توخمەکان لێکدەترازێنێ و هەورە تریشقەش هێرش دەباتە سەر چیا.
ئەستێرەی بێگوناهان، تۆ تاقە ئەستێرەی منی، هۆ ئەی یار!

II

بۆ ئاخاوتن زمانی یۆنانیان پێ بەخشیم؛
بۆ خانوو، کەلاوەیەکی کەساسیان لەسەر کەناری هۆمێر پێ بەخشیم.
تاقە دڵەڕاوکێی من ئەوەیە کە ئەم زمانە لەسەر کەنارەکانی هۆمێر دروستکرا.
لەوێندەرێ سارگ و ماسییە سوورە هەن
وشەش لە ژێر با دەجمێن
لاوێتییان لە نێو لاژەوەردا بەرز دەکەنەوە
بەقەد ئەوەی لە هەناومدا
ئیسفەنج و مێدووز دادەگیرسان
وێڕای هەوەڵێن سروودی بووکی زەریادا
سەدەفی زێڕینی ڕەنگ پەمەیی بەخۆیان و گرانەتایانەوە.
تاقە دڵەڕاوکێی من ئەوەیە کە ئەم زمانە یەکەمین گرانەتای هەیە.
لەوێ خوداوەندی ڕەشتاڵە هەن،
داربەهێ و دارهەنار، خزم و هاوکاران
ڕۆنیان ڕۆ دەکرد، لە قووڵایی جەڕەکانیش تەڵخ دەچووەوە؛
سرووشی خوداوەندیش لە شیوە بۆخۆش بە
داربندوق و چنارۆک
بەزەنجەفیل و گوڵەزەردە
هەر لەگەڵ جریوەی یەکەمی فیسقەکان بەرز دەبێتەوە،



درووده شیرینەکان لەگەڵ هەوەڵێن هەلەلویا!
تاقە دڵەڕاوکێی من ئەوەیە کە ئەم زمانە لەگەڵ هەوەڵێن هەلەلویا!
لەوێندەرێ لۆریە و دارخورما هەن
ستایش بخووورداگیرساندن هەیە
پیرۆزبایی لە جەنگ و تفەنگە کۆنە لوولە درێژەکانمان دەکات.
گەڵامێو وەک فەرش لە زەمین ڕاخراوە
تاوەی کون کون بۆ ڕژانی گۆشتی بەرخ، لەیەک دانی هێلکەی کولاو «مەسیح زیندوو بووەوە»
لەگەڵ یەکەمین دوعا و پاڕانەوەی هێلینییەکان.
عەشقێکی سۆفی مەشرەب لەگەڵ ڕستە یەکەمەکانی سروود.
تاقە دڵەڕاوکێی من ئەوەیە کە ئەم زمانە لەگەڵ ڕستە یەکەمەکانی سروودە!

1

دەمم لە ناو قوڕە سوورە * گیرا بوو، ناوی تۆی هێشتا لەسەر زار
زارۆڵەی ئاونگداری پەمەیی * هی خوناوە هەوەڵینەکان
هەر لەو کاتەوە * لە قووڵایی کازێوەوە
خەتی لێوان و * دووکەڵی قژ شێوەی دایتێ
پاشان ئەلفوبێی * یۆنانی بۆ ئەوەی لەفزی بکەیت
توانایەکی هەواییشی * پێ بەخشیت بۆ ئەوەی هەنگاوی چەسپاو هەڵنێیت

ئا لەو ساتە ورد دیاریکراوەوە * هەر وەکو لە ناو مندا
زیندانێکی نەناسراو کرابێتەوە * بۆ باڵندە سپییە تۆزلێنیشتووەکان
لە ناو هەودا لە دەم چەقەچەقەوە * دایانە شەققەی باڵ و ئیتر تێگەیشتم

که له تۆوه خوێن سەر هەڵدەدات * هەر له تۆوه فرمێسک چۆڕەی دێ
گەلێ لە مێژایە ئەم جەنگە * سەخت و باڵا لە هەمان کات
هەموو ئەفسوونێک لە تۆدایە * هەموو جوانییەکیش.

لە نێو ئۆرگی جەنگەڵەکاندا * سەمای چەک لە دەستان گرمەی دێ
شمشێری دووفاق و ڕم * گوێم لە تۆ بوو،
بانگەوازی فرمانی عەیبئامێزی * ژیانێکی چڕ و پاکیزەت دەکرد
وێڕای درەوشانەوەی ئەستێرە کەسکەکان و * پەیڤەکان بریقەهاوێژ بوون
بەجۆرێک کە لە سەرەوەش لە نێو خەڕەند * توانیم شمشێرە گەورەکە بناسمەوە
تیژ * گەلێ سامناک!





## هەنگاو بەرەو بەرە

له بەرەبەیانی پیر یۆحەننا، ڕۆژێک دوای جەژنی ئێپیفانی[٢]، فرمان دەرچوو کە دەبێ سەرلەنوێ بەرەو بەرە بکەوینەوە ڕێ، بەرەو شوێنێ کە نە ڕۆژی ئاسایی لێیە نە یەکشەمووان. ئێمەش دەبوایە ملکەچی فرمان بین، بڕۆین بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو هێلانە بدەین کە چەند سەعاتێک دەبوو، جەنگاوەرانی ئارتا و شەیمارا تا دەگاتە تێپێلێنی لە جەنگدا بوون. لەبەر ئەوەی هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کەوتبوونە جەنگ و بێ ئەوەی پشوویان هەبێت؛ نزیکەی نیوەیان لەو جەنگە کوژرابوون و ئیتر ئەوانی دی لە توانایان نەبوو شەڕی دیکە بکەن.

دوانزە ڕۆژ بەسەر کشانەوەی ئێمە بەرەو گوندەکانی دواوە تێپەڕی بوو. هەندەی نەبردبوو کە گوێمان بەشێلانی زەمینی ئاوریشمین ڕاهێنابوو، زۆر بەشەرمیشەوە واتامان دەدایە سەگوەڕ یا دەنگی زەنگە دوورەکان، ئا ئەوەتا سەرلەنوێ فرمانمان دەدەنێ بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ گوێگرتنی گرمەگرمەکەی کە پێی ئاشناین: دەنگی سست و قورسی تۆپ و دەنگی وشک و نێرڤۆزی دۆشکە.

شەو لە دوای شەو و بێوچان هەنگاومان دەنا یەک لە دووی ئەویترەوە، هەر وەک ڕۆیشتنی کوێران. زۆر بەزەحمەت پێیەکانمان لە نێو قوڕ و چلپاو هەڵدەکێشا و هەندێ جاریش تاکو ئەژنۆ نغرۆ دەبووین. چونکە زۆر جار، باران هەندە دەباری، چ لە دەرێ، چ لەسەر ڕێگاوبان و چ لەناو دڵمان. ئەو کاتە کەمانەی کە وچانێکیشمان دەدا، کەس ورتەیەکی نەدەکرد، ڕووگرژ و بێدەنگ بووین، بەئاگرێکی کزی دارسنۆبەر، مێوژیشمان بەسەر یەکتر دەبەخشییەوە. هەندێ جاریش، ئەگەر ئیمکان بوایە، ئەوە جلوبەرگەکانمان

(٢) یا جەژنی سەرهەڵدان یا دەرکەوتن. (وەرگێڕ).

دادەکەند و زۆر بەگوڕ، تاکو ئاستی خوێن لێهاتن، لەشمان دەڕوانی. چونکە کێچ تاکو ژێر پێستیشمانی تەنی بوو، شتێک بوو زۆر لە شەکەت بوون قورستر بوو. بۆ دواجاریش، ساتی وا هەبوو کە لە نێو شەوەزەنگەوە گوێمان لە فیکەیەک دەبوو، هێمایەک بوو بۆ ئەوەی بکەوینەوە ڕێ و سەرلەنوێ هەر وەکو ئاژەڵ زۆر بەسەختیی هەنگاومان هەڵدەنا بۆ ئەوەی بگەینە جێ، پێش ئەوەی ڕۆژمان بەسەر بێت و ببینە نیشانەی فڕۆکەکان. چونکە ئەوەی پەیوەندی بەنیشانە و شتی دیکەوە هەبێت لەم شوێنە، خوداوەند ئاینی نییە و هەر وەکو نەڕەێتیش، هەتاو لە هەمان کاتدا هەڵدێت.

ئا بەو جۆرە، لە نێو دۆڵەکان دەنووستین، سەرمان لە بەر قورسایی وەنەوز بەلادا شۆڕ دەبووەوە و هەرگیز خەونیش سەری لێ نەدەداین. باڵندەکانیش لێمان زویر دەبوون چونکە هیچ واتایەکمان دا نانا بۆ ئەو شتەی کە ئەوان دەیانوت- یا ڕەنگبێ لەبەر ئەوە بێت بێ هۆ سروشتمان دەشێواند. ئێمە ئەو جوتیارە زۆر سەیروسەمەرانە بووین و بێڵی سەیر و ئامێری حەوجۆشمان لە دەست، کە بۆ ترس دەرکردن دەشیان.

دوانزە ڕۆژ بەسەر کشانەوەی ئێمە بەرەو گوندەکانی دواوە تێپەڕیی بوو و بەسەعات سەیری ئاوێنەمان دەکرد و لە خەت و سیمامان ڕادەماین. وەکو چۆن چاوانمان ئاشنایەتی لەگەڵ سیمامان پەیدا دەکرەوە و ئێمەش بەشەرمەوە، واتامان دەدایە سەرووی لێوێکی ڕووت یا ڕوومەتێکی تێر خەو، هەر بۆ شەوی دووەم بەواتایەک لە واتاکان گۆڕاین، بۆ شەوی سێیەمیش زیاتر، بۆ شەوی دوایی و شەوی چوارەم ئیتر زۆر ئاشکرا بە ئەوانەی پێشوو نەدەچووین. لەمەش زیاتر تێکەڵی لەشکرێک دەبووین، هەموو بەهەمان جوامێرییەوە، جەنگاوەران لە ئەسڵ و فەسڵی جیاواز و لە زەمانی جیاوازەوە، هەندێک هی ئێستا بوون و هەندێکیش هی زەمانی بەسەرچوو؛ هەموو بەهەمان شێوە ڕیشی درێژ و پانیان سپی دەکرد. ئەفسەرە ڕووگرژەکان بەخۆیان و تەپڵە تەنگەکانیانەوە، کەشیشی خوێنتاڵ



PDF 4 KURD

و عەریفە قوتاربووەکانی جەنگی ٩٧ و ١٢، نەقیبە دلڕەقەکان تەورەکانیان بەسەر شانیانەوە گڕ دەدا، پاسەوانە بیزەنتییەکانی سنوور کوتەک بەدەست و لە قەڵغانەکانیانەوە هێشتا خوێنی تورکان و بولغارەکان دادەچۆڕێ. هەر هەموو پێکڕا، بێ قسەکردن، هەر لە ئەزەلەوە، پێکەوە عارەق دەردەکەین و هەناسە هەڵدەکێشین، بەدۆڵ و بنارەکانا دەڕۆیشتین، بواری بیرکردنەوەمان لە مەڕ هیچ شتێکەوە نەبوو. بۆ ئەمەش، چونکە ناهەمواری بێوچان بارستایی زۆری لە سەر ئەستۆی مرۆڤ هەیە، ئەم ئینسانانەی کە بەخراپە ڕاهاتبوون، لە کۆتاییدا ناوەکانیان گۆڕی، بەدبەختیان بەقەدەر ناو لێنا- ئا بەم شێوەیە ئێمەش ڕێک و ڕاست بەسەر شتێک هەنگاومان دەنا کە نەفرەتمان ناو نابوو، هەر ڕێک بەوە دەچوو کە باسی کەش گۆڕین و بارودۆخی هەوامان بکردبایە. زۆر بەسەختی پێیەکانمان لە نێو قوڕوچڵپاو دەردەهێنا و هەندێ جاریش تاکو ئەژنۆ نغرۆ دەبووین. چونکە زۆر جار، باران هەندە دەباری، چ لە دەرێ، چ لە سەر ڕێگاوبان و چ لەناو دڵمان.

چەندەش لەو شوێنانە نزیک دەبووینەوە کە ڕۆژی ئاسایی و یەکشەممووانی تیا نەبوو، نە نەخۆش و نە پیرەمێرد، نە دەوڵەمەندی تیا بوو نە هەژار، لەمەش تێدەگەین. چونکە سەرەڕای گرمەگرمی ئەودیو، جۆرە ڕەشەبایەک بوو لە پشت قووتەی شاخەکانەوە، تا دەهات زل دەبوو، بەڕادەیەک لە کۆتاییدا، دەنگی سست و قورسی تۆپمان لە دەنگی وشکی نێرڤۆزی دۆشکە جیادەکردەوە. چونکە لە لایەکی دیش، تا دەهات دووبارە دەبووەوە، تووشی کاروانی بریندار دەبووین کاتێ لە لێوارەکانی دییەوە دەگەڕانەوە. برینپێچ و نیشانەی خاچی سوور لەسەر باسکیان، بینینی ئێمەیان بەهەل دەزانی و نەقالەکانیان دادەنا، تفیان ڕۆ دەکردە نێو لەپ و وەکو شێت سەیری جغارەیان دەکرد. پاشان کە ئەوەیان دەزانی کە بەرەو چ کەرتێک دەڕۆین، سەریان دەلەقاند و دەستیان دەکرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی دڵتەزێن و تێرۆریان دەکرد. ئێمەش تەنها سەرنجی شتێکمان

دەدا، ئەو دەنگانە بوو کە لە نێو شەوەزەنگەوە دەهاتن، بەجۆشوخرۆش لە زفتی خەرەندەوە یا لە گۆگردەوە هەڵدەستان. «ئای، ئای، مانا موو»، «ئای، ئای، دایکە»، هەندێ جاریش، زۆر بەدەگمەن، بەپەسیوێک دەچوو بتاسێ، نزیک بوو لە پرخەپرخ، هەر کێیەک گوێی لەمە بوایە دەیزانی کە ناڵەناڵی گیاندانە.

هەندێ جاریش زیندانی جەنگیان دابووە دوای خۆیان، چەند سەعاتێک لەوەو پێش، بەناکاو، بەدەستی دەورییەکانا گیرابوون. بۆنی شەراب لە دەمیانەوە دەهات و پڕ بەڕکیشیان موعەلەب و شوکۆلاتە بوو. بۆ ئێمە، ئەمە بەترانییەک بوو بۆ خۆی، نەدەچووە عەقڵەوە، چونکە هەموو پردەکانی دواوەمان ڕووخابوون و ئەو چەند بارگیرەی کە لە گەڵیشمان بوون، لە نێو بەفر و قوڕوچڵپاوە لووسە، بەسەزمانانە حەپەسابوون.

لە کۆتاییدا، لە پڕێکدا، لە دوورەوە دووکەڵ لەم لاو ئەو لاوە شەپۆلی دەدا و بەرز دەبووەوە و یەکەمین سوورایییش لە ئاسۆوە دەرکەوت، ساروخە ڕۆشنکەرەوەکان بوون.

2

گەلێ لاوم و بەڵام * دەنگی هەزارساڵەم تیا نیشتەجێیە
هیچ لە قووڵایی دارستان نییە * کاتێک گوێمان لە شریقەی چرێشین دەبێ

بەڵام حەپەی هاری سەگێ کە * بەباڵای چیایا هەڵدەشاخێ کە ئینسان تەوافی کرد
لە خانووە نزمەکانەوە دووکەڵ * و بەسزمانەکان گیان دەدەن
ئەم تەماشاکردنەی کە پێناسە ناکرێت * جیهانەکەی دیکە پڕی لە ئازار کرد



نەخێر، کاتێک دڵخۆشن لەناو با * قیرەی حاجیلەقلەقە زیقنەکان
کاتێک ئاشتی وەکو باران دێتە خوارێ * و لە باخچەکەش ڕووەک مرخەیان دێ
بەڵام کاتیک ئاژەڵەکە تەلاش دەدات * ئاویلکەیەکی درێژی تاساو
لەمەربەمیشەوە دوو جاران * لەدەوری چاوانی ڕەشە کارەسات
بۆ گلێکۆیەکی تەختی دەشتایی * و بەروانکەیەکی پانی ژنان

بەڵام ئەو زرمەیەی کە لە دەرگا هەڵدەستێ * و کاتێکیش پرسیار دەکرێ:کەس لەماڵ نییە
تاکو ئیشارەتی دەستێکیش نییە * ڕوونی شەختەیی پەرچەمی هەبێ
سەرەڕای چەندین ساڵی چاوەڕوانی * قەد حەوانەوەم بۆ نەبوو
کاتێکیش کاتی دابەشکردن دێت لەگەڵ براکانم * تەنها بەشێکی سەخت و ڕووگرژم دەدەنێ
پۆشاکم بەردە قەڵغانی * شێوەی ماریشی هەیە.

III

هەمیشە ئەو دەوڵەمەندییەی کە داتمێ
بێوچان قەبیلە دڕندەکانی ئەم کێشوەرە لەتوپەتیان کرد و
یا تەنانەت لە لای ئەوانەی کە بەعەنعەناتن، بێوچان، بە باڵای شکۆمەندیا هەڵدەشاخن!
هێشوو بەخشرایە باکوور و
گوڵەگەنمیش لە باشوور کەوتە خوارێ
هەندێکیان بێ شەرم بارمتەیان لە ڕەوتی با وەردەگرت و
هەندێکی تریشیان بێ باوەڕ، دوو تا سێ قات پارەیان

له کاری پیرۆزی درەختانەوە هەڵدەپاچاند.
بەڵام بەنیسبەت منەوە،
جگە لە جاترە کە بەسەر نووکی تیرە وردیلەکانی هەتاوەوەیە نەمتوانی
هیچی دیکەم چنگ کەویت و هەروەها جگە
لە چرووسکانەوەی ئاوی ناو ڕیشی کۆڵنەدەرم،
هەستم بەهیچی دیکە نەکرد
سەدە دوای سەدە، بەڵام زبر، ڕوومەتم خستە سەر تۆوی زبرتر لە بەرد.
بۆ ماوەیەکی زۆر وەنەوزم دەدا، لە دڵەڕاوکێی ڕۆژانی داهاتوو دەژیام
هەر دەقاودەق وەک ئەو سەربازەی کەوتبێتە سەر تفەنگەکەی.
ڕۆ چوومە نێو چاکەخوازییەکانی شەو
هەر چەشنی زاهیدێ ڕۆ بچێتە نێو میهرەبانی یەزدانەوە.
لە نمەکی عارەقم گەوهەرێکیان داتاشی و
بەبێ ئاگاداری منیش جێگۆڕکێیان بە
مەریەمی ڕۆئیام کرد.
بەختیارییەکەمیان بەناولەپ کێشا و بچووکیان بینی
هەر وەکو پێشوولەیەکیش فلیقاندیانەوە.
دڵخۆشییەکەمیان دا بەعەردا و پێشێلیان کرد و لە ناو
جەرگەی بەردیشدا
حەپسیان کرد
لە کۆتایشدا ئەم دڵە بەردەمیان بۆ هێشتەوە
وێنەی سامناکی منە.
بەتەورداس، بەهێز تێی بەربوون،
گوێزانێکیان بەهێز تیا ئاخنی،
بەخەنجەری تیژکراو تاشییان، ئەم بەردەم.



بەڵام تا زەمەن مادده بکرۆژێ
هەندە بەئاشکرا
پێغەمبەرایەتی لەسەر ڕوخسارم ڕووناک دەکاتەوە:
بەرامبەر بەقینی مردووان بلەرزن
بەرامبەر بەو گابەردانەی کە تاشیان!

IV

حیسابی ڕۆژگاری خۆم بەڵام بەبێ ئەوەی لە هیچ لایەک
بتدۆزمەوە، بۆ ئەوەی لە نێو نەڕەی خەڕەندا دەستم بگری و
دەستم بگری لە نێو کاولستانی ستارەم!
هەندێک زانستیان دەسگیر بوو و هەندێکی دیکەش دەسەڵات
بەهەموو نرخێ تاریکیان شەق کرد و
بەهۆی دەمامکە بچووکەکانیشەوە، چ هی کامەرانی چ هی نیگەرانی،
ڕوخساری خۆیان لەگەڵ داوێنپیسی دەگونجاند.
منیش، بەپێچەوانەوە، یاسای دەمامکم ڕەت کردەوە،
دڵخۆشی و غەمگینیم لە دووی خۆم جێهێشت،
ئازادانە، لە دووی خۆم توورەم هەڵدا
چ دەسەڵات چ زانست.
حیسابی ڕۆژگاری خۆم کرد و بەتەنها مامەوە،
هەندێک دەیانوت: بۆچی؟ ئەویش مافی ئەوەی هەیە
خانوویەکی لە ئینجانەی گوڵ هەبێت و بووکێکی سپییش.
ئەسپ و کراسی ئاگرین و کراسی سیا، گریان لە میزاجم
بەرامبەر بەهیتران بەردا، هێلینە هەر سپییەکان!
بۆ گەڕانێکی دی، ئەفسووناوی تر، لە کۆتاییدا سووتام و

هەر لەو شوێنەی کە ڕێیان لێگرتم، نادیار، بەسمکۆڵ
غارم دا و بارانم بۆ کێڵگە گەڕاندەوە و
لە گەڕانەوەشدا خوێنی مردووە بێ کفنەکانم کرد!
هەندێک دەیانوت: بۆچی؟ ئەویش مافی ئەوەی هەیە
خۆ ئەویش، دەبێ ژیانی ماڵ لە تەماشاکردنی هێترانەوە بناسێ.
ئەم تەماشاکردنانەم نوقسان بوو، هیچم دەسگیر نەبوو
جگە لە فرمێسکی نێو بەتاڵی زیاتر کە ئامێزم بۆی دەگرتەوە
جگە لە تۆوی نێو ئاسوودەگی کە بەدەستییەوە ئازارم دەکێشا.
حیسابی ڕۆژگاری خۆم کرد بەڵام بەبێ ئەوەی بتدۆزمەوە،
ئیتر چەکم بەست و خۆم بەتەنها دۆزییەوە،
لە نێو نەڕەی خەڕەند و لە نێو کاولستانی ستارەم!

3

کەواتە هەر بەتەنها * حوکمڕانی ئازارم کرد
تەنها دەستم بەسەر * سەوزەڵانی جێهێڵراوی جۆزەردان
دا گرت
تەنها هەوای بۆندارم * پەڕش و بڵاوکردەوە
بەسەر زەمینی کێڵراو * لە نێو باڵندەکانی ئەلسیۆن(٣)
گوڵی تۆزی زێڕم ئاودا * سەوزیم کردە بەر گردان
بەهێز سەلییەی ئاڵم * بەسەر بیابانا پرژاند
بەخەنجەرم وت لە ڕیشاڵی * هاوار قووڵتر نەبێت
هەوەها وتیشم: نایەکسانی * لە خوێن بەهاتر نەبێت!
مستی بوومەلەرزەش * مستی برسێتی

(٣) باڵندەیەکی ئەفسانەییە، لە دەوروبەری ئاو دەژێ. (وەرگێڕ).



دەستی دوژمن و * دەستی دۆست
شێت و هاریان کردم * وێران و کاولەساتیان بۆ نامەوە
جارێک و * دوو و سێ
خیانەتیان لێکردم و * بەتەنها لە مەیدان مامەوە
شاڵاویان بۆ بردم و ملیان * وەکو قەڵاتۆکە کەچ کرد، تەنها
ئەو پەیامەی کە ڕاموەشاند * هەر خۆم و بەتەنها خۆم لێپرسراوم!

هەر بەتەنها شکست * لە مەرگیش
بەتەنها گازم لە * ناوەوەی زەمەن بەکەڵبەی بەردین گرت
تەنها، بەرەو شوێنە دوورەکان * کەوتمە ڕێ
عەوداڵ چەشنی تریشقە- * بەنێو ئەتیرا
لە نێو دەسەڵاتم نێمێزی(٤) * حەوجۆشی تیژ و ژاکان
بۆ ئەوەی بتوانم بەناو غوبارا * بەژێر چەکدا هەنگاو نێم
وتم: تەنها هەر بەشمشێری * ئاوی تەزیو پێویستە بجەنگم
هەروەها وتیشم: تەنها هەر بەبێگەردی زیهنم * دەتوانم زاڵ بم!

سەرەڕای بوومەلەرزە و * سەرەڕای برسێتی
سەرەڕای دوژمن و * سەرەڕای دۆستان
من، ڕەگم داکوتی و بەرگریم کرد * ڕۆح و هێزم پەرەیان ساند
جارێک و * دوو و سێ
لەسەر زاکیرە * خانووی خۆمم دروستکرد، بەتەنها
بەتەنها، خەرمانەی تیشکم دەست کەوت و * بەتەوێڵم دا پێچامەوە
ئەو کێڵگەیەی کە باسم کرد * هەر خۆم و بەتەنها دووریمەوە!

(٤) نێمێزی: خوداوەندی تۆڵە و دادە لای یۆنانییە کۆنەکان. (وەرگێڕ)،

## بارگیرەوان

هەر لەو ڕۆژانەدا بوو، دوای سێ هەفتەی ڕەبەق، یەکەمین بارگیرەوان گەیشتە کەرتەکەی ئێمە. باسی گەلێ لەو گوندانەیان بۆ دەکردین کە بەتەنیشتیانا تێپەڕیبوون، دێلڤینۆ، ئاژیوا ساراندا، کۆریتسا. (هارێنگ) ماسییە هیشکبووەکان و پسکێتەکانیان داگرت، چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە هەر دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێ و زوو هەڵبێن. چونکە بەمە ڕانەهاتبوون و ترسی ئەو گرمەگرمانە کە لە چیاکانەوە دەهات و ئەو ڕیشە ڕەشانەی کە ڕوخساری داگیرکردبووین، دایگرتبوون.

هەر بەڕێکەوتیش، لای یەکێکیان پارچە ڕۆژنامەی کۆن دەست دەکەوت. هەموو بەحەپاساوییەوە خوێندمانەوە، سەرەڕای ئەوەی کە شتێکی زۆریشمان لەو بارەیەوە بیستبوو، چۆن شکۆدار، قوتار بووەکان، بەسەرکەوتنەوە دەگەڕانەوە پایتەخت و چۆنیش جەماوەر لەسەر شان هەڵیان دەگرتن کاتێک بەمۆڵەت، لە نووسینگەکانیانەوە بەرەو پرێبیێزا و ئارتا دەگەڕانەوە. هەموو ڕۆژەکە زەنگ لێی دەدرا، لەسەر تەختەی شانۆش، ئێواران گۆرانی دەوترا و بۆ ئەوەی چەپڵە بەمیللەت لێدەن، سکێچ(٥) لەمەڕ ژیانی مەوە ساز دەکرا.

بێدەنگییەکی قورس نێوانمانی تەنییەوە، چونکە ئەمە بۆ چەند مانگێک دەچوو کە ئەم لاتەریک بوونەمان دڵەڕەقی کردبووین و بەبێ ئەوەی لای کەسیش ئەوە بدرکێنین، ڕۆژەکانمان دەژمارد. تا ئەو ڕۆژەی کە عەریف زۆیس دەستی بەگریان کرد و ئەو پارچە کاغەزانەشی تووڕ هەڵدا کە دەنگوباسی دونیای تیا بوو و هەر پێنج قامکەکەی کردنەوە و بەهێمای

(٥) شانۆنامەی بچووکە و تەنها هەر لە یەک دیمەن پێکدێت. (وەرگێڕ)



نەفرەت، خستییە سەر سەری. ئێمەش هیچمان نەوت، تەنها بەتەماشاکردنی، میهرەبانی خۆمانمان بۆی دەرخست.

ئا لەو کاتەدا، لەفتێری، جوامێرانە، لە سووچێکدا خەریکی پێچانەوەی سیغارێک بوو، پێی دەچوو هەموو غەمی دونیای لەسەر ئەستۆ کۆبووبێتەوە، ئاوڕی دایەوە و وتی: «عەریف، بۆچی وا خۆت تووشی ئەم بارودۆخە دەکەیت؟ ئەوانەی کە بۆ هارینگ و پسکێت دەسنیشان کراون، چارەنووسیان هەر چۆنیک بێت، هەمیشە هەر دەبێ بگەڕێنەوە. ئەوانی دیش، خۆ تۆمارکردن کۆتایی نایەت. بەڵام شتێک هەیە کە جێی گومان نییە: تەنها ئەو کەسەی لەگەڵ سێبەر کەوتۆتە جەنگەوە کە تیایا دەژی، سبەینێ، شوێنێکی لەبەر دەسگیر دەبێت». زۆیسیش: «ئێ چیترا! بڕوات وایە منیش هەر وەکو هەموو خەڵکی دیکە ژنێک و پارچە زەوییەک و دڵێکی گوشراوم نییە، کاتێک لێرە دانیشتووم و پاسەوانی ئەم ڕەوتە دەکەم ئا لەم تاوارگەیە؟» چۆن لەفتێری وەڵامی دایەوە: «ئەو شتەی کە کەس خۆشی ناوێ، ئا ئەوەتا عەریف، دەبێ لەو شتە ترسمان هەبێت، چونکە ئەو شتە هەر لە ڕەچەڵەکەوە ونمان کردووە، با بەهەموو هێزیشمانەوە هەوڵی ئەوەی بدەین کە خۆمانی پێوە گرێ بدەین، ئەمە هیچ شتێک ناگۆڕێ. بەڵام شتانی دڵ، ممکین نییە ونی بکەین، مەترسن، هەر لە پێناوی ئەم شتانەیە کە لە تاراوگە دووچاری ئەو ڕەوتە بووینە. چ ئێمڕۆ چ سبەی، ئەوانەی کە دەیانەوێ بیدۆزنەوە، دەیدۆزنەوە». بەڵام عەریف زۆیس پرسیاری کردەوە: «بڵێ، کێن ئەوانەی کە دەیانەوێ بیدۆزنەوە؟» ئیتر لە فتێری، لەسەرخۆ بە پەنچە ئاماژەی کرد: «برای خۆم، تۆ و من و گشت ئەو کەسانەی کە لەم کاتەدا گوێیان لێمانە».

هەر لەهەمان کات، لە ناو هەوا گوێمان لە فیشکەی تۆپێکی تاریک بوو، تەقی. هەموو لەسەر سک پاڵکەوتین و کەپوومان بەر ئیلێبۆریس کەوت، چونکە ئاراستە نادیارەکانمان لەبەرە و هەر بەگوێش دەزانین تۆپەکە دەڕوات و سکی چ عەردێک هەڵدەدڕێ و دەتەقێتەوە. بەڵام تۆپەکە زیانی

له کـەس نەدا. چەند بارگـیـرێک جـووتکەیان هاویشت و ئەوانی تریش بەراست و چەپدا بلاویان لێی کرد. له ناو دووکەڵیش، پیاوانمان بینی چۆن کەوتبوونە شوێنیان و بە چ زەحمەتییەکیش تاکو ئێرە سەریان خستنەوە. ڕەنگ پەڕیو، هارێنگ و پسکێتەکانیان دادەگرت، چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە هەر دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێ بۆی دەرچن، چونکە بێ ئەزموون بوون و چونکە بەمە ڕانەهاتبوون و ترسی ئەو گرمەگرمانەی کە له چیاکانەوە دەهات و ئەو ڕیشە ڕەشانەی کە ڕوخساری داگیرکردبووین، دایگرتبوون.

4

تەنها هەر پەڕەسێلکەیەک لێرەیە * بەهارێکی دەگمەنە ئەمجارە
بۆ ئەوەی هەتاو جارێکی دی بگەڕێتەوە * زەحمەتی زۆری دەوێ
پێویستە هەزاران بمرن * لەبەردەم پاچکەکانی
زیدەوەری کەمیشی ناوێ * بۆ ئەوەی خوێنی پێ ببەخشن

خودایە کرێکاری یەکەم * له نێو چیا گەمارۆت دام
خودایە کرێکاری یەکەم * له ناو زەریا ئابلۆقەت دام

پاشا مەجووسەکان جەستەی * سووکی منیان هەڵگرت
له ژێر کۆنترین غەواسە * نغرۆیان کرد
فڕێیان دایە تاریکترین * بیرەوە
دەبا میسک * هەموو تاریکستان و گشت قوولایی ئاو داگیر کات.

خودایە کرێکاری یەکەم * له ناو لەیلەکی ئازار
خودایە کرێکاری یەکەم * بۆنی بووژانەوەت لا خۆشە!



ڕاوەشاو هەر وەکو تۆمار * لەناو ڕەحمی ڕەشی دا
پێشوولەی سامناکی زاکیرە * ناو زەمینی کرۆشت
وەک چۆن جاڵجاڵۆکە گاز دەگرێت * گازی له ڕووناکی گرت
کەنار درەوشایەوە * هەر هەموو زەریاشی لەگەڵ.

خودایە کرێکاری یەکەم * کەنارت بۆ دیاری کردم
خودایە کرێکاری یەکەم * له نێو چیادا ڕەگهاژووت کردم

V

ڕەگەکانم وا له دڵی چیاکانن و
ئەم چیایانەش، میللەتان لەسەر شان هەڵیان گرتووە و
زاکیرەش لەسەر ترۆپکەکانی دەسووتێ
وەک چیلەکەی گڕ گرتوو.

زەمەن تووشی شڵەژانێکی تەواو هات و
ڕۆژگاریشی بەپێیەکانییەوە هەڵواسی
بەتەقەتەق هێسک و پلووسکی داماوانی ڕشت.
کێێ و کەی و چۆن بەسەر ئاوەکانا هەڵشاخێن؟
چەند لەشکر و کێ؟
ئاسمان ڕووی گۆڕی و ئا ئەوەتا دوژمنانیشم
بەرەو دوور پەرت و بلاودەبنەوە.
زاکیرەی میللەتەکەم، ناوت پاند یا ئاتۆس دەنێین.
تۆ تەنها کەسێکی کە ئینسان بەپاژنەیەوە دەناسیتەوە
تۆ تەنها کەسێکی بەدەمی بەردەوە دەدوێی.

تۆی کە ڕوخساری پیران تیژ دەکەیت و
تۆی کە لەسەر ئاوی چاخەکاندا
داهاتووی لەیەلەکی پەسلان ڕادەکێشی!
هەر کە پەنجەت بەر ڕۆحم بکەویت زارۆکی بەهار ئازار دەکێشێ!
هەر کە سزای دەستم بدەیت لە شەوی سپیدا دەبریسکێتەوە!
تۆ هەمیشە و هەمیشە بەناو گڕا تێدەپەڕی تاکو بگەیتە شەوقدانەوە
تۆ هەمیشە و هەمیشە بەناو شەوقدا تێپەڕ دەبیت
تاکو بگەیتە ترۆپکەکانی چیای شکۆداری بەفرین.
بەڵام ئایا دەبێ چ بن چیـــا؟ دەبێ لە ناو جـــەرگی چیـــا چی هەبێت؟
ڕەگەکانم وا لە ناو جەرگی چیادان و
ئەم چیایانەش، میللەتان لە سەر شان هەڵیان گرتووە و
زاکیرەش لە سەر ترۆپکەکانی دەسووتێ
وەک چیلەکەی گڕگرتوو!

VI

شاعیری تەم و ئاوی کەفاوی لە ناخی من وەنەوز دەدا!
گوانی ڕەشەبای تاریک لە نێو لێوانی مەرکەبیی دایە و
ڕۆحی وێڵە بەهەڵپەیە بەرەو شەهوەتی زەریا کە
بەسەر پێیە - چیایەکانیدا دەیتەرزێنێ(٦)!
بای ثراس تاکو داربەڕووی تفتیش لە ڕەگەوە هەڵدەقەنێ.
گەمییە چارۆگەدارە بچووکەکانیش بەدەوری خۆیانا دەخولێنەوە
لە نێو بادا شڵپەیان دێ و لە پێش چاو ون دەبن.

(٦) کردن بەتەزرە. (وەرگێڕ).



پاشان لە بەرزاییەکان، لە ناو هەوراندا
لە پشتەوەی خەڕەندی سەختدا دەردەکەونەوە.
بەگەوهەری لەنگەران قەوزەکان نووسان
ریشی خەمۆکی پیران.
بەهۆی پزیسکی درەوشاوەی ڕوخساریان
بەندەری ئەفسووناوی دەهێنێتە لەرزە.
بەڕۆژوو، تەماشای بەتاڵی پیرەمێردان وەردەچەرخێ
لە کاتێکدا ژنان تارمایی خۆیان دەردەخەن
ڕەش بەرامبەر بەگەچە بێگەردەکان.
لە ناوەند ئەواندا، منیش دەستم دەبزوێنم
شاعیری تەم و ئاوی کەفاوی!
فلچەکەم بەباشی دەخەمە ناو قووتووە نابووتەکەی ڕەنگ و
دەست دەکەم بەنیگارکێشان:
زۆر نییە لە کاردان
زێڕی کێوی و ڕەشایی پیرەکانی ئیقۆن!
پیر کەناری یارمەتیمان بدە و بمانپارێزە!
پیر میواولی یارمەتیمان بدە و بمانپارێزە!
پیر مانتۆ یارمەتیمان بدە و بمانپارێزە!

VII

دەرپەڕین
بەبەرگی «دۆستانەوە»
دوژمنانم بێ ئەژمارە
بەپۆستاڵ خاکی بابوباپیرمیان پێشێلکرد.

بەڵام ئەم خاکە هەرگیز ئاشنایەتی لەگەڵ پاژنەی واندا نەبوو.
هێنایان
پسپۆر و داگیرکەر و ئەندازیار،
کتێبی زۆری پڕ لە پەیڤ و ژمارە،
هەرە بەتوانا و گوێڕایەڵترین،
ئاگری بابوباپیرانیان کەویی کرد.
بەڵام ئەم ئاگرە هەرگیز ئاشنایەتی لەگەڵ کوانووی وان پەیدا نەکرد.
تاقە هەنگێکیش، بۆ ساتەوەختێک نەیهێشت زێڕەکەی بەرن
تاقە شنەیەکیش، بۆ ساتەوەختێک، نەیهێشت سپێتی بەروانکەی بەرن.
لەسەر چیاکان و لە نێو دۆڵەکان، لە بەندەرەکانیش
بورجی پتەو و ڤیلا
کەشتی و تەختەی دیکەی سەر ئاو کەوتوو،
یاسا، ئەوەی کە بوار بەسوو و چەوساندنەوە دەدات،
تەتبیقکردنی ئەمانەیان بەگەزی بابوباپیران پێوا.
بەڵام ئەم گەزە هەرگیز ئاشنایەتی لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەوان نەبوو.
هیچ شوێنەواری یەزدان لە نێو ڕۆحیاندا بچووکترین تالاوی جێنەهێشت
هیچ غەمزەیەکی کرمی زەریا هەولی ئەوەی نەدا کە وشەیان لێ بقەپێنێ.
دەرپەڕین
بەبەرگی «دۆستانەوە»
دوژمنانم بێ ئەژمارە
دیاری بابوباپیرانیان پێشکەش کردین.
بەڵام لە جەوهەردا، دیارییەکانیان تەنها



ئاگر و ئاسن بوون.
لە نێو پەنجە شاشەکانیان تەنها
هەر چەکی ئاگر و ئاسن چاوەڕوان بوون.
هەر تەنها چەکی ئاگر و ئاسن.

VIII

دەرپەڕین
بەهێما زێڕینەکانیانەوە
کەڵەبابی باکوور و دێوە زەبەلاحەکانی ڕۆژهەڵات!
ئا ئەوەتانێ لەشیان کردمە دوو بەشەوە
پاشانیش لەسەر جەرگم کردیانە چەقەچەق
هەڵهاتن.
دەیانوت «بۆ ئەوان بۆنوبەرامەی هۆلۆکۆست و
بۆ ئێمەش دووکەڵی شکۆداریی، ئامین»
ئەم زایەڵەیەش لە قووڵاییی ڕابردووەوە دەردەپەڕی
هەر هەموومان گوێمان لێی بوو و لێی تێگەیشتین.
ناسیمانەوە و جارێکی دیش
بەدەنگێکی برینگەوە گۆرانیمان وت:
پۆڵا بۆ ئێمە، پۆڵای خوێناوی بۆ ئێمە
خیانەتی سێ فاقەی سازکراویش.
بۆ ئێمە کازیوەی بەمسەوە هەڵواسراو و
پاشانیش دان، دانی جیڕبووەوە تا ئەم لەحزەیە،
تا ئەم دوا لەحزەیەی
فێڵە و ئەم تۆڕە نادیارە.

بۆ ئێمە خشان لەسەر عەرد
سوێندخواردنی قووڵایی شەوەزەنگ
پەشیمانی بێ بەزەییانە
بەبێ هیچ، بەبێ هیچ پاداشتێک و هەرگیزاو هەرگیز.
برایان باش گەمەیان پێ کردین!
دەیانوت «بۆ ئەوان بۆنوبەرامەی هۆلۆکۆست و
بۆ ئێمەش دووکەڵی شکۆداریی، ئامین»
بەڵام تۆ، لە نێو دەستمانەوە دەڕوانیتە چرای ئەستێرە
بە وشە داتگیرساند، زاری بێگوناە
ئەی دەروازەی بەهەشت!
کاریگەریی دووکەڵ لە ڕابردوو دەبینین
ئەو یارییە بێگەردەی سروشتی تۆیە و
ئەم دەسەڵات و ئەم حوکمڕانییەی کە هی تۆن!

5

لەگەڵ چرای ئەستێرەدا * بەرەو ئاسمانەکان ڕۆیشتم
بەناو پاراوی کێڵگەکاندا * تاکو تاقە قەراغی دونیا
لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

لاسکە ڕێحانە غەمگینەکان * وەنەوز زیواندوێتی
لە هەنیەمەوە دەردەپەڕن * هەناسە هەڵدەکێشم و بەتەنها دەڕۆم
لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

سەرووەری هەزار گزنگ * پاشای مەجووسی ژوورە تاریکەکان
جادوولێکراوی داگیرساو * ئەوەی داهاتوو دەخوێنێتەوە پێم بڵێ



لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

کیژەکانم لە پرسەدا * بۆ تەوافی هەموو چاخەکان
کوڕەکانم تفەنگ * بەبێ زانیاری هەڵدەگرن
لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

شەوانی بەهێز خاوەن هەزار دەست * قوبەی ئاسمان پڕ دەکات
هەناوم هەلاهەلا دەکەن * ئا لە نێو ئەم خراپەیەدا دەسووتێم
لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

لەگەڵ چرای ئەستێرەدا * بەرەو ئاسمانەکان ڕۆیشتم
بەناو پاراوی کێڵگەکاندا * تاکو تاقە قەراغی دونیا
لەو شوێنەی کە توانیم دڵم بدۆزمەوە * گریانی شەنگی چوار گەڵایی

## دەرچوونە گەورەکە

ئا لەو ڕۆژانەدا، لاوەکان کۆبوونەوەی نهێنییان چێ دەکرد، چونکە هەواڵە ناخۆشەکان لە پایتەختدا پەرەیان دەستاند و بڕیاری ئەوەیان دا کە بەخۆیان ئەو تاقە شتەی کە پاراستبوویان بڕژێنە شەقام و گۆڕەبانەکان: دەستی خاک لە کراسەکانیان لەگەڵ مووی ڕەش و خاچێکی بچووکی هەتاو دەردەکەوت. لەو شوێنەی کە توانا و هێز هی بەهارن.

لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژەش نزیک دەبووەوە کە وڵات بەبۆنەی ڕاپەڕینێکی دییەوە ئاهەنگی ساز دەکرد: ساڵڕۆژی سەربەخۆیی بوو، ئەو ڕۆژەیان بۆ دەرچوون هەڵبژارد.

سەرلەبەیانی، لەبەر هەتاو پێشدەکەوتن، لە نووکی پێ تا تەوقی سەر، لەجیاتی بەیداغ، بەبوێری پۆشتەبوون، لەبەر ئەوەی قوولەقاپی ئەو لاوانە ئاوساو بوو، بەخوێڕیان دەچواند. هەندەی نەبرد حەشامات هاتن، ژن و پیاو، بریندارەکانی جەنگیش، ئەوانیش بەدارشەق و لەفافەی برینەوە ئامادە بوون. هەر خێرا و چرچولۆچییەکی زۆریش لەسەر ڕوخساریان دەرکەوت، ئەو چەند سەعاتە بەچەندین ڕۆژ دەچوو.

ئەم جۆرە ڕووبەڕوو بوونەوەیە، دەکەوتە بەرگوێی هیترانەوە، ئەوانیشی دەخستە نێو شڵەژانێکی گەورەوە. سێ جار بەتوانای خۆیانا چوونەوە، هەر خێرا بڕیاریان دا و ڕژانە شەقام و مەیدانەکان، تاقە شتیشیان پاراستبێ: گەزێکی ئاگرین لە لوولەیەکی پۆڵاینەوە، نووکی تیژ و کەڵبەی هەتاوی هەبوو. لەو شوێنەی نە لقێ نە گوڵێ، هەرگیز دڵۆپە فرمێسکێکیان نەڕژت. بەڕاست و چەپ دەستیان وەشاند، چاویان لەبەر بێ هیوایی داخست. بەهاریش تا دەهات بەسەریانا زاڵ دەبوو. هەر وەکو ئەوەی لەسەر گۆی زەمین ڕچەیەکی دیکە نەبێت لەمە زیاتر، بۆ ئەوەی بەهاری پێدا



تێپەڕێ، بێدەنگ بوون، چاو دەیڕوانییە دوور، دەگەیشتە ئەودیوی سەغڵەتیی، کەوتنە سەر ئەو ئاشتییە هێمنەی کە بێوچان ئەو لاوە قوولەقاپ ئاوسانەی کە بەخوێڕی دەچوێنران و ئەو ژن و پیاوانە و ئەو بریندارانەی کە بەدارشەق و لەفافەی برینەوە دەهاتن و پێکدەگەیشتن.

سەعاتێکی نەبرد، پێی دەچوو چەندین ڕۆژ تێپەڕیبێتن. دڕندەکان حەشاماتیان پاچکرد و ئەوانەشی کە مانەوە خستیانە ناو عەمبارەوە. بۆ ڕۆژی دوایی سی کەسیان لە پاڵ دیوارەکەش ڕیز کرد.

6

عەدالەتی ئاشکرا ئەی هەتاوی زیهن * تۆش ڕێحانەی بەجۆشی شکۆمەندیی
نەکەی تکات لێ دەکەم نەکەی * ئای نیشتیمانەکەم فەرامۆش نەکەی!

لا ڕووی لاری چیا بەرزەکانی * کردە بورکانی ئەو ڕەزە گرژانەی قەد قەدپاڵەکان
هی خانووی سپی تر * لەوەی هاوسێی ئاسمانی شین بن!

لەچەند لایەکەوە دەگاتەوە ئاسیا * پشتیشی هەندێک داوەتە ئەورووپا
ئەتیر تاقە جێگایەتی * زەریاش تاقە ئاسۆ

هیچ دوودڵییەک لەمەڕ بیانییەوە نییە * نەبۆ براکەشی دەنکێ هاوڕێتی
هەر تەنها پرسە هەیە، ئاخ * ڕۆشناییش بێ بەزەیییە!

دەستەکانم بەهۆی گەزەنگی بڵاچە هەلاهەلا بوون * نوقمی دەکەمە پشتەوە

زەمەن

بانگی هاوڕێ کۆنەکانم دەکەم * لەشکری تیرۆر و خوێن!

بەڵام خوێن لەبەر برین سپی هەڵگەڕا * ئاخ بۆ تیرۆریش هیشک بووەوە
ئێستاش یەکیان لە ناو ئەویتریانە * بەپێچەوانەوەش با دەلوورێنێ!

عــەدالەتی ئاشکرا ئەی هەتاوی زیهن * تۆش ڕێحــانەی بەجــۆشی شکۆمەندیی
نەکەی تکات لێ دەکـەم نەکەی * ئای نیشـتیـمانەکـەم فەرامـۆش نەکەی!

IX

فەرموون ئەمە خۆیەتی
ئەو کەسەی کە هەرگیز نایبینین، یەهودای ئێمە!
حەوت دەرگا لە تەماشا دەیپارێزێ
لە کاتێکدا کە حەوت لەشکر لە ژێر دەسەڵاتی دەلەوەڕن.
میکانیکی هەوایی بەرزی دەکاتەوە و
لەبەر فەروو و لەشی پوولەکەداری قورس بووە،
لەسەر چیمەنی ئێلیزێ و کۆشکە سپییەکاندا دایدەنێ.
زمانی تایبەتی خۆی نییە، کەواتە هەموو زمانێک هی ئەوە –
نە ژنێکیش هەیە، کەواتە هەموو ژنان هی ئەون –
خاوەنداری هەر بەتوانا!
ساوێلکەکان دەحەپەسێن
کاتیک لە درەوشانەوەی حەمیمی کریستال پرسەدارە ڕەشپۆشە بەرێزەکان



بزە دەیانگرێ،
کاتێکیش لە کوونی لیکابێت دا
پڵنگە نیمچە ڕووتەکان گەمە دەکەن!
هەتاویش چیــتـر توانای نیـیــە شـوورەتی خـۆی لە داهاتوودا بچەقێنێ،
ڕۆژی حیسابیش نییە، تەنها لەبەر ئەوەی
براکانم، ئێمەی هەر خۆمان ڕۆژی حیسابین و
دەستمان نەمریی بۆ دەمینێتەوە –
کاتێک لە ڕوخساری دراوە زیوینەکان دەدەین!

X

ئەلەکسـەندەرە نوێیـەکـان گـاڵتـەجاڕیی خـۆیان هەڵڕشـتـە سـەر ڕوخسارم
باش تەماشای بکەن، بەمەسخەرە کردنەوە، ئەم توریستە ساوێلکەیەی ئەم سەدەیە!
جۆرە گەلحۆیەکە
کاتێک کە هەموو غەمگینین ئەو دڵی خۆشە و
کاتێکیش هەموو دڵخۆشین ئەو بەبێ هۆ نارەزایی خۆی دەنواند
لالووتە بەرامبەر بەهاوارمان و بێخەم دوور دەکەوێتەوە و
گوێشی دەنێتە سەر بەرد،
ڕەق و تاقانە،
لەو شتەی کە بۆ مە نادیارە ئەو لێی دەپشکنێ.
ئەوێک تاقە دۆستێکی نییە،
تاقە موریدێکیشی نییە
لە جەستەی خۆی بترازێ باوەڕ بەکەسی دیکە ناکات و

لە ناو دڵی گەڵای ئاکاتی هەتاو لە غەیبی مەزن ورد دەبێتەوە،
فەرموون ئەمە خۆیەتی،
دەربەدەری یەکجارەکی دانوساندنە گەورەکانی چەرخە!
لەبەر ئەوەی بێ مێشکە
ناتوانێ قازانج بەفرمێسکی خەڵکی بکات و
لە ناو دەوەنیشدا ڕاراییپیەکەمان دەبریقێتەوە
تەنها هەر بۆ میزکردنێکی سادە دێتە خوارەوە.
ئەو دەجاڵی بێ موبالاتە، ئەو ئەهریمەنی کێچەڵنانەوەی چەرخە!
کاتێکیش ئێمە هەموو لە پرسە داین،
ئەو هەتاو هەڵدەگرێ.
کاتێکیش ئێمە هەموو گاڵتە بەلووتبەرزیی دەکەین
ڕادەپەڕێت.
کاتێکیش ئێمە هەموو داوای شەڕوەستان دەکەین،
ئەو شمشێر هەڵدەگرێت.
ئەلەکسەندەرە نوێیەکان گاڵتەجاڕیی خۆیان هەڵڕشتە سەر ڕوخسارم!

7

ئا ئەمەیە، هەر ئەمەیە گەردوون * گەردوونی دیکە و هەر خۆشێتی
بەهەلاڵە ئاوس بوون و ئەستێرەکانەوە * لە باخۆس و نزا و پاڕانەوەوە
ئەستێرەچنەکان * خۆشەکەرە مەزنەکانی قەوزەی زەریا
کاتێک یاداشتەکان خاو دەبنەوە * کاتێک وەهمەکان ئاوا دەبن
هەر هەموو هەمان گەردوونە * هەر ئەمەشە گەردوون خۆی
هەرا و زەنا * و ئەم پێکەنینە پووچەڵەش لە ئاسۆ!



ئا ئەمەیە، هەر ئەمەیە گەردوون * گەردوونی دیکە و هەر خۆشێتی
ڕێگری شەهوەتی گەنیوو * بەرزکەری کانییە دڵخۆشەکان
هاندەری کارەساتەکان و * گەردەلوولەکان، قوربانی
چەماوە، گێڕوگەواڵ * کێوی، تووکن
هەموو شەوێک بەشمشاڵەکەیەوە * هەموو ڕۆژێک بەکەمانچەکەیەوە
لە نێوان کەناری شاران * لە نێوان چارۆگەکانی کێڵگە
ئەوە خۆیەتی بەسەرە زلەکەیەوە * ئاخ خۆ ئەمە خۆیەتی گوڵی نێرنە

هار و توورە * بەزەحمەت - زاو
کوڕی ئاژیت * و سولێمانە

ئا ئەمەیە، هەر ئەمەیە گەردوون * گەردوونی دیکە و هەر خۆشێتی
ئینجانەی گەنیوی ڕەحەت بوون و * کشانی پەشیمانی و ئاسمانە هەورینەکان
مامۆستای داهێنەری بورجناسی * شایەری گومەزە ئاسمانییەکان
دوور لەو شوێنەی مانگ دەگیرێ * هەندە دوور کە خەلق دەدرەوشێتەوە
هەر هەمووی گەردوونە * ئا ئەمەیە گەردوون
کەڕەنا و چەک * ئەم هەورە بێکەڵکانەی ئاسۆش!

## کێلگەی گەزەنگ(٧)

یەکێ لەو ڕۆژە بێــهــەتاوانەی زســتــانی پار، شــەمە، بەیانی، ڕەوە ئوتومبێلێک و ماتۆر، دەوری گەڕەکە هەژارەکەی لێفتێریان گەمارۆ دا، پەنجەرەی خانووەکان موحەجەرەی ئاسنیان هەبوو، سیانیش بەناوەند شەقامەکانا دەڕۆیشت. بەلوورەی دڕندەوە، بەڕوخسار قورقوشمین و قژیش وەکو قەسەڵ ڕەق، دەهاتنە خوارەوە. فرمانی ئەوەیان دەرکرد کە هەموو پیاوان لە کێڵگەی گەزەنگەکە کۆ ببنەوە، لە نووک پەنجە تا تەوقی سەریش چەکیان بەستبوو، چەکەکانیان ئاراستەی حەشامات کردبوو. ترسێکی زۆریش کوڕانی داگیر کرد، چونکە بەلایەن کەمەوە، هەر یەکەیان یا شتێکیان لە گیرفانی شاردۆتەوە، یا ئەوەتا لە ناو ڕۆحیان ڕازێک هەیە. ناچار بوون و ئەرکی سەر شانیان جێبەجێ دەکرد و چوونە ریزەکەوە و ڕوخسار قورقوشمییەکان قژ ڕەقەکان وەک قەسەڵ، پۆستاڵ ڕەشەکان، تەلبەندیان بەدەوریانا بەست. حەشاماتیان کردە دوو بەشەوە، بەفری تواوەش دەستی کرد بەبارین و شەویلاگەش ناچار بوو ددانەکان ڕاگرێ، لە ترسی ئەوەی هەڵنەیەن یا نەشکێن.

لە هەمان کات، لە دیوەکەی دیکە، ڕوخسار سێبەر، هێدی هێدی نزیک دەبووەوە: پەنجەیەکی بەرز کردەوە و کاتیش لە سەعاتە گەورەکەی فریشتان دەستی بەلەرزین کرد. هەروەها بەرامبەر ئەو کەسەش ڕاوەستا، هەر خێرا ئەوانی دیکە دەستیان بەلێدانی کرد و بەریان دایەوە و پێشێلیان کرد. تاکو ئەو لەحزەیەی کە چووە پێش لێفتێری ڕاوەستا. ئەویش لە شوێن خۆی جمەی نەکرد. تەنها لەسەرخۆ چاوی هەڵبڕی و سەیری خاڵێکی دووری دەکرد– سەیری داهاتووی دووری خۆی دەکرد– ئەوی دیکە هەستی

(٧) مەبەست لە رووەکی گەزەنگە: "قراص"ی عارەبی و "ortie" فەرەنسی.



بەسەدمەیەک کرد و بەرەو پشتەوە، بەهەڵپە کشایەوە، هەر وەخت بوو بکەوێت. وەک شێت، چمکێکی کلێتەکەی بەرز کردەوە و تفێکی ڕۆ کردە سەر دەموچاوی. بەڵام لێفتێری هەرگیز لە شوێن خۆی جمەی نەکرد.

ئا لەم کاتەدا، بیانییە گەورەکە، ئەوەی لە پشتەوە دەڕۆیشت و سێ خەتی لەسەر شان بوو، دەستی نا بەقەبرغەیەوە و دایە قاقای پێکەنین: وتی، تەماشایان کەن، بەباشی تەماشایان بکەن، وەکو پێی دەچێ، مرۆڤ وا دەزانێ کە دەتوانێ ڕێڕەوی جیهان بگۆڕێ! ئەم بەسەزمانە، ئەوەی نەدەزانی کە دەست لە حەقیقەت دەدات، سێ قامچی وەشاندە سەر ڕوخساری. بۆ سێیەم جاریش لێفتێری لە شوێن خۆی جمەی نەکرد. بەو سەرکەوتنە کەمەی نێو دەستی، ئیتر چاوی هیچی دیکەی نەدەبینی، نەشیدەزانی چ بکات، دەمانچەکەی دەرهێناو نایە سەر ڕەگی گوێی ڕاستی و زرمەی لێهەڵساند.

کوڕانیش گەلێ ترسان و ئەوانەشی کە ڕوخساریان قورقوشم و قژیان ڕەق وەک قەسەڵ و پۆستاڵی ڕەشیان لە پێ بوو، وەکو مۆم سپی هەڵگەڕان. ئیتر پاشان ئەو ناوە جمەی دەهات، دەتوت بوومەلەرزە رووی داوە و پزسکیش لە دەوروبەری زنجەکان دیار بوون: لە زۆر شوێنیشەوە کاغەزی ڕەش وەک قەرەبرووت لە پەنجەرەکانەوە دەکەوتنە خوارەوە و لە دوورەوەش دەمانبینی، لەودیو هەتاو، ژنان لەسەر ئەژنۆ، لەو مەیدانە داماوە، پڕ لە گەزەنگ و چەوی ڕەشی خڵتانی خوێن، دەگریان. لە هەمان کات، دوانزە زەنگ لە سەعاتە گەورەکەی فریشتان بەرز بووەوە.

8

چاوم بەرەو پەنجەرە * زۆر ڕۆشنەکان گڕ دەدا
غەرقی ڕۆندک بوون
لە دەرەوە ڕادەمام * درەختەکانی نێو شیو
بەفر قورسی کردبوون

وتم، براکانم * تاکو ئەم درەختانەش
رۆژێ دادێ ئابڕوویان دەچێ
پیاوانی ڕوو سێبەر * لە ناوەندی سەدەکەی دیکە
خۆیان بۆ تاوان ئامادە دەکەن

گازم لە ڕۆژگار گرت * بەڵام تۆزقاڵێ
دڵۆپە زومەرەدی خوێن نەچۆڕێ
لەبەر دەروازەکان لوورەم هات * بەڵام دەنگم ڕەنگی
غەمباریی پیاوکوژانی وەرگرت
لەناو چەقی زەمیندا * ناوکێکی تاریک دەرکەوت
تاریک، تا دەهاتیش تاریک
گزنگی هەتاویش * خۆی کردە دەزووڵە، تەماشا کەن
بەرەو مەرگ دەچێت!

ژنە سیما تاڵەکان * بەخۆتان و عەبا ڕەشەکانتانەوە
ئێوە ئەی مەریەمان، ئێوە ئەی دایکان
ئەوانەی کە لە تەنیشت حەوزەکانن * حەز دەکەن ئاو
دەنە پەڕەسێلکە ناسکەکانی پەری
خۆ شارۆن * پڕ بە ناولەپی
کارەساتی پێ دان
لە قووڵایی بیرەکان * قیژە و زریکەی چەندین
مردووی بێ تاوان بەرز دەبێتەوە
ئاگر و قین * هەندە بەخراپی تێکەڵ دەبن
میللەتەکەم وەختە لە برسا بمرێ



گەنمی خوداوەند * لەناو لۆریە گەورەکانە و
ئاوا دەبێت
لەمە بەدواوە لە شارە چۆڵوهۆڵەکە * و لاتەریکەکە، تەنها
هەر تاقە دەستێک دەمینێ
لەسەر دیوارە گەورەکانی * زیندانە بەرزەکان نیگاری
**نان و ئازادی دەکێشێ**
جاریکی دیش شەو دەلوورێنێ * ماڵەکان دەکوژێنەوە و
لە نێو ڕۆحمیشدا درەنگ داهات
نزیکێک نییە وەڵام داتەوە * لە هەر جێگایەک دەدەم
وا زاکیرە دەمکوژێ
وتی: براکانم * ساتە ڕەشەکان دێن
زەمەنیش ئەمەی دەوێ
لەززەتی ئینسان * تاکو هەناوی دێویشیان
تەنی
چاوم بەرەو پەنجەرە * زۆر ڕۆشنەکان گڕ دەدا
غەرقی ڕۆندک بوون
لەبەر دەروازەکان لوورەم هات * بەڵام دەنگم ڕەنگی
غەمباریی پیاو کوژانی وەرگرت
لەناو چەقی زەمیندا * ناوکێکی تاریک دەرکەوت
تاریک، تا دەهاتیش تاریک
گزنگی هەتاویش * خۆی کردە دەزووڵە، تەماشا کەن
بەرەو مەرگ دەچێت!

XI

لەهەر کوێیەک بن براکانم، بەتەنگتانەوە دێم
لە هەر کوێیەک پێتان دانێن
حەوزیک ئاوەدان کەنەوە،
ماڤرۆینی، حەوزە تایبەتەکەی خۆتان.
تا بڵێی ڕوونە ئەو ئاوە
تا بڵێی بەردە ئەم دەستە هیشک بووەوەی نوێژنیوەڕۆیە کە
هەتاو لە ناو لەپی چاڵی کۆ دەکاتەوە.
دەزووڵە ئاوێکی فێنک، من شاگەشکە دەبم.
ئەم سترانەی کە درۆ نازانێ
بەدەنگی بەرز بیرکردنەوەکانم ڕاڤە دەکات،
تاکو میزاجی تاڵی دڵم ڕوون کاتەوە.
ئەمە سامناکییە،
قەنارە ئابڕووی درەختەکانی بردم و
تەماشاکردنەکانیشم لێڵ بوون.
چۆک دادەدەم،
کاتێک ئەو چوار ڕێیانەی کە پێیان ئاشنا بووم، بنبەست دەبن.
سەلجۆقییە تێلا لە دەستەکان حەسحەسی لێ دەکەن.
شاگانەکان، وەک سیسارکە کەچەڵە گەلەکۆمە ساز دەکەن.
سەگگێیەکان و مردوونێژەکان و شەوئامێزەکان
دۆشەکی دوارۆژ ڕادەخەن.
براکانم، تەنانەت لە هەر کوێیەک خراپە ببینن،
لەهەر کوێیەک کەچبینتان کات،



دیۆنیزۆس سۆلۆمۆس تان بێتەوە یاد و
ئەلەکسەندەر پاپادیامانتیستان بێتەوە یاد.
ئەو گۆرانییەی کە درۆ نازانێ
رووگرژیی شەهید خاو دەکاتەوە
لێوەکانیشی هەندێک لە ناو عەتری ئاسمان نغرۆ
دەکات.
تا بڵێی ڕوونە ئەو ئاوە
تا بڵێی بەردە ئەم دەستە هیشک بووەوەی نوێژنیوەڕۆیە کە
هەتاو لە ناو لەپی چاڵی کۆ دەکاتەوە.
لە هەر کوێیەک پێتان دانێن، بەتەنگتانەوە دێم،
تیایا بکەنەوە، براکانم، تیایا بکەنەوە
حەوزێکی تیا بکەنەوە
ماڤرۆینی، حەوزە تایبەتەکەی خۆتان!

XII

تا لە قووڵایی نیوەشەویشدا، لە نێوە مەرەزی وەنەوزدا ئەم بێ
هەواییە و ئەم پێشوولەیەی مانگەش گینگڵم پێ دەدات!
لە ناو چەرچەفدا گینگڵ دەدەم و چاوانیشم لینج لە نێو
شەوەزنگدا
بێسوود تەلاش دەدەم:
هۆ ئەی باکان، ئەی پیرەمێردی ڕیش بەهەیبەتەکان، ئێوەی
پاسەوان و
کلیلی زەریا کۆنینەکەمان لە لایە، بۆ ئەوەی چاوم پاگژ بکەنەوە
دۆلفینێکم بۆ بکەن، بۆ ئەوەی چاوم پاگژ بکاتەوە،
با خێرا بێت و با یۆنانی بێت، با لە سەعات یانزەی تەواویش

لێرانە بێت!
با لە کاتی هەڵمەت برندا، مەرمەڕی قوربانگە وەلاوە خات و
بۆچوونی شەهیدیش چاکساز کات
با کەفی ڕوونی دەرپەڕێنێت
بۆ ئەوەی باز سپێتی کاهینیش داوەشێنێ!
لە هەڵمەت برندا، بنکەی خاچ هەڵتەکێنێ و
دارستانیش ئاوڕێکی ڕاست لە تەختە بداتەوە
بۆ ئەوەی ئەم زرمە زلەش ئەم بهێنێتەوە
یادم کە هێشتا هەم!
بۆ ئەوەی کلکە فراوانەکەی زاکیرەم تیژ کات
لە دەرەوەی ڕچەکانی پەشیمانی کە گەلێ جار کوتراون
پاشانیش لەبەردەم هەتاوم دانێتەوە
هەر چەشنی چەوێکی زۆر کۆنی سیکلادەکان!
لە ناو چەرچەفدا گینگڵ دەدەم و دەستانیش کوێر لە نێو
شەوەزنگدا
بێسوود تەلاش دەدەم:
هۆ ئەی باکان، ئەی پیرەمێردی ڕیش بەهەیبەتەکان، ئێوەی
پاسەوان و
کلیلی زەریا کۆنینەکەمان لە لایە، ئێوە سیغە سیحرییەکە شک دەبەم
دڕکە سێدانەکەتان بچەقێننە ناو دڵم
لەگەڵ ئەو دولفینە ئەم دڵەش لە خاچدەن
هێمایەک دێت ئەوە بسەلمێنێ کە من لە هەققەتدا هەر ئەمەم و
لەگەڵ لاوییە هەوەڵێنەکەمدا بەرەو لاژەوەردی بێگەرد ئاسمان سەر
دەکەوم- دەڕۆم
لەو بەرزاییانە حوکمڕانیی دەکەم!



## XIII

دەستەکانم خلّتانی ڕاڕایین، چۆن چۆنی بیانکەمەوە؟
بەرەو کوێ چاوم گڕ دەم؟ تەماشاکردنەکانم وڕێناوی دەستی حوکم
لێکراون
ئەی ئادەمیزاد، چی تر بلێم؟
زەمین لەبەر ئەشکەنجە دڵڕەق بووە، بەڵام ڕۆحیش هەزار ئەوەندە!
ئەی ئافەرین سەرەتای لاوییم و بۆ تۆش ئەی لێوی دەستەمۆ
نەکراو کە
لە چەوەوە هونەری زریان فێر بوو!
بەرامبەر بەرێژنەش، وەڵام هەورە تریشقە بوو
ئەی ئافەرین سەرەتای لاوییم!
تۆ هەندە قووڵ لە ناو خاکدا ڕەگت داکووتیم و بیرکردنەوەکانم
سەوز
بوون!
گەلێ ڕۆشناییت خستە خوێنمەوە و ئەڤینیشم فێرە
دەسەڵات و دەلالەتی ئاسمان بوو.
ئێستا لە نووکی پێ تا تەوقی سەر پاگژم
هەر هەموومان ماددەیەکی بێکەڵکین لە بەردەم مەرگ و
نێچیریی شکستین لە نێو چرنووکە تیژەکانی.
ئەی ئادەمیزاد، لە کێ مەترسیم هەیە؟
هەناوم- فەرمووببینن: من گۆرانی خۆمم وت!
دەریام بەسپێتی بای باکوورەوە لێ بقەپێن،
پەنجەرە فراوانەکە کە لیمۆکان لە بەردەمیا دەلەرینەوە،
ئەو هەزارەها جریوەجریوەی پەڕشوبڵاوە و ئەو کیژۆڵەیە -

ئەوەی کە تەنها هەر بەدەست بەرکەوتنێکیم بەسە بۆ ئەوەی
بەختیارییەکەی داگیرم کات –
فەرموو بیانبەن: من گۆرانی خۆمم وت!
خەونەکانم بەرن، چۆن چۆنی لێکدەدەنەوە؟
بیرکردنەوەم بەرن، لە کوێی ئەزموونی خۆتان تاقی دەکەنەوە؟
ئێستا لە نووکی پێ تا تەوقی سەر پاگژم.
بەماچێکی دەم لەشێکی نەگەچراوم بەختیار کرد.
بەهەناسەی دەم، فەرووی زەریام ڕەنگین کرد.
هەموو ئەفکارەکانم بەسەر دوورگەکانا پەرشوبڵاو کردەوە.
بەسەر هۆشیاریمدا، لیمۆم زۆر بەچاکی گووشی.

XIV

پەرستگا بەئاسمانەوە و
جوانیی کیژۆڵەش
هێشوویەکە زۆر بەباشی لە نێو دانمان گونجاوە!
باڵندە لەو بەرزاییە گرژیی دڵمان خاو دەکاتەوە
لە نێو ئەو شینایییە تیرەی کە زۆرمان خۆش ویست!
لە بەرزایی لە بەرزایی
گەڵاوێژی ناسک لە کراسی رووناکی دا و
خەرمانانی هیشک هەڵاتووی ڕاخراو، بەخۆی و هەنگاوە نارێکەکانی.
لە بەرزایی و
لە نێو چاوانی خەرەندی قووڵ دا و
بێ ڕاڤە، ئەستێرەی زەریای لێیە و
لە نێو چاوانی خەرەندی قووڵ دا و



خۆرئاوا بوون بەبێ ئامانجە!
وریایی ئینسانیش سنووری بۆ تخووبەکان دانا.
قەراغی جیهانیشی شورابەست کرد و
لە قەراغێکی ئاسمانەکانیش بەشێنەیی نۆ دیواری یەک لە دوای یەکی
دروستکرد، لە سەر مەرمەڕی قوربانگەکە جەستە ڕاکشاو،
سەری بڕی
بەرامبەر بەهەر دەرچەیەکیش پاسەوانێکی دانا
چونکە وریایی ئینسانیش سنووری بۆ تخووبەکان دانا.
پەرستگا بەئاسمانەوە و
جوانیی کیژۆڵەش
هێشوویەک زۆر بەباشی لە نێو دانمان گونجاوە!
باڵندە لەو بەرزاییە گرژیی دڵمان خاو دەکاتەوە
لە نێو ئەو شینایییە تیرەی کە زۆرمان خۆش ویست!
لە بەرزایی لە بەرزایی
بای باکوور بەخۆی سەنداڵە پۆلاییینەکەیەوە و
گرێگۆس، ئاهەنگی دڵخۆش بەچارۆگە سوورە لەراواکانی
لە بەرزایی
لە ناو گڵکۆ ڕەشەکان بەهەڕەشە کردن و شێڕاندنی
چەوهاویشتنی تاریکەوە،
توورەیی مردوان کۆبۆتەوە و
لەسەر خۆ لە ناو بادا، بەدان جیڕکردنەوە
سینگ بەرەو پێشەوە، پەیکەری گابەرد، بەسامناکییەوە،
جارێکی دیش گەڕانەوە!

## 9

هەوریان لە دووی خۆ جێهێشت * پەیکەرە لە گابەرد دروست بووەکان
سەفەر دەکەن
سینگ دەرپەڕیو هەر وەک ئەوەی کە * بەرەو دڵی با کە داهاتووە
پاڵی پێوە بنێ
لە ترسی ئەوەی کە سیسارکە کەچەڵە، * نەچێت و گەمارۆی بدات!
هەندە نییە بۆنی پیا کردووە

زەنگ لە بۆ مەرگ لێدەدرێت * مێگەلی گوندەکان دێنە خوارێ
بەسەر ئەو بنارانەی کە زەریای لێوە دەبینرێت * دەنگێکیش
دڵی بای شڵەژاند * ئەفسووس، برسێتی،
دڵی باش تاریک کردین * ڕۆڵەکانم، برسێتی

لە کارگە شاراوەکانیان * میللەتان زێڕ دەکەنە گەنم
لە ئیشی * ئاسن دان
نان دەدەنە ئەو دێوەی کە نایانەوێ * لمۆزیشی تا دێت گەورە دەبێت
تاکو کەسێکیش نامینێ * تەنها گوێمان لە شەقوپۆقی ئێسقان دەبێ

بەڵام پێش ئەوەی کە زەمین لە شیوەکەدا بێتە لەرزە * وتیان هادێسی
بەرەوە قیژاندی
کاتێک بنمیچی خانووان هەڵتەکان * پەدیدەیەکی نەبینراو بوو هاتە دی
ژنان بێدەنگ گوێ دەگرن * لە هاواری منداڵە ساواکان!



ئەم ژیانەی کە مەرگ بۆنی کردووە * ڕووت وەکو هەتاو گەڕایەوە لامان
چونکە مەخابن، چونکە هیچی دیکەیان نییە * ئەو ژیانەی کە هەمیشە
بەفیڕۆیان دا
لەسەر وێرانەخاک * گولیلکێک چەسپێندراو دەبریسکێتەوە!
ئەگەر بێت و بازێک دەنگی * مەڕێکی هەناودڕاو کۆبکاتەوە
گوێ بەسەر چیمەنەوە * تووڕەیی مردووان
گوێمان لێی دەبوو * چۆن ڕایدەکێشێ
دەست بەسەر لایەکەی دیکەی سێبەر بگیرێ * بۆ ئەوەی لایەکی دیکەی
ببینرێ!

## تەوێڵەی بەرخۆڵە

میللەتەکەم بەم جۆرە هاتە زمان: ئەو عەدالەتەی کە فێریان کردم، هەر وەکو خۆی ماوەتەوە و ئەوەتاش چەندین سەدە تێپەڕین، لەگەڵ ئەمەشدا، ڕووت و قووت و بێزارم لەوەی کە هەمیشە لەبەردەم تەوێڵەی بەرخۆڵە دام. مێگەل شارەزای دەنگم بوو و بەبچووکترین فیکەش، هەڵدەبەزینەوە و دەیانباڕاند. ئەوانی دی و هەمیشەش هەر هەمان کەس بوون، ستایشیان بۆ ڕێکوپێکی من دەکرد، بەسەر چەپەر بازیان دەدا و یەکەمیش بوون کە پێ بخەنە ناوەند تەوێڵەی بەرخۆڵە. منیش ئا ئەوەتام، هەمیشە ڕووت و قووت و بەبێ سێبەری مێگەل - میللەتم ئازار دەکێشێ. دانیان لەبەر برسێتییەکی مێژینە، بریقەی دەهات و ڕۆحیشی زاخاوی لێ دادەچۆڕی وەکو چۆن پۆستاڵی بێهیوایی بەسەر ڕێگای بەردڕێژدا دەشێلێ.

ئەوانەشی کە خاوەن دەسەڵاتی تەواو بوون، کاتێک گوێیان لەم ناڵەناڵە دەبوو، ترسیان لێ دەنیشت. چونکە بەوردی ئیشارەتەکانیان دەناسییەوە و زۆر جاریش، هەر لە دوور ڕا بەرژەوەندییەکانیان دەپاراست. هەر خێرا، پێڵاوی دەجاڵیان کردە پێ. نیوەیان هەڵمەتیان بردە سەر نیوەکەی تر، هەر پارتە و دەیویست سەرنجی میللەت بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، شتی لەم جۆرەی دەوت: ئیشەکانتان پوختە و جوانن. تکایە سەرنجی ئەوەش بدەن کە دەرگا داخراوەکەی تەوێلەکە لێرەوەیە. دەی ئازا! ئێمە لەگەڵتانین. لە بەردەم ئاگر و ئاسن سڵ مەکەنەوە. ئەمە کاری ئێمەیە. بەتەنگی ماڵەکانتانەوە مەیەن، خەم بۆ خاوخێزانتان مەخۆن و هیچ شتێک سڵتان پێ نەکاتەوە، با هاواری کوڕێکیشتان بێت، یا هی باوکێک یا هی برایەکی بچکۆلانە، مەگەڕێنە دواوە. ئەگەر هات و یەکێکتان ترس دایگرت، یا خەم و خەفەت، یا حەزی کرد بگەڕێتە دواوە، با ئەمە بزانێ: گوناه دەچێتە سەر ئەستۆی و ئەو ئاگر و ئاسنەی کە لاشمانە بەسەر ئەودا دەیبارێنین.

ڕاوێژەکانیان هێشتا تەواو نەبووبوو، کات بەرەو گۆڕان دەچوو، دوور لە ناو هەوران و لە ناو کۆبوونەوەی حەشاماتدا بەدەر کەوت. هەر وەکو ئەوەی لوورەی بێت با دوو لەت کات، هەر وەکو ئەوەشی کە لەشی فڕێ دابێتە کەنار، ئەمجارەیان بێ تاقە دڵۆپێ زاکیرە. هەر هەموو، ڕەنگ پەڕیو، چاو ئەبڵەق و چەناگە بەرز، بەڵام دەست لە گیرفان، گرژ بەسەر پارچە ئاسنێکەوە، قەڵەنگی گڕ یا شتی دیکەی نووک تیژ و قەد بڕ. بەتەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن، کەس هەستی بەبوونی ئەوەی دیکە نەدەکرد. لە ڕیزەکە، کوڕ باوکی ڕێک دەکرد و کوڕی گەورەکانیش بەتەنگی لاوانەوە دەهاتن. لەبەر ئەم بارودۆخە تایبەتەش، گەلێ لە موڵک و خانوو و بەرە بەجێهێڵران و گەلێ لە ژنانیش دوو سێ جار پرسەیان گرتبوو. کاتێکیش دەیانویست، پیاسەیەک بکەن و کەمێک زیاتر دوور کەونەوە، هیچ نەبوو. تەنها هەر با بوو کە لە نێو کۆڵەگەکانەوە و لە نێو ئەو بەردە کۆبووانەی کە لەم لاو ئەو لا کۆبووبوونەوە و وەک ڕەژوو سووتابوون، لوورەی دەهات! تەنها دووکەڵ دیار بوو کە نەوازشی لەگەڵ تەرمەکان دەکرد.

سی و سێ مانگ دەردەسەری درێژەی خایاند. لەم ماوەیەدا، لە دەرگا درا بۆ ئەوەی تەوێڵەی بەرخۆڵەکانیان بۆ بکەنەوە. بەڵام کەس گوێی لە بارەی بەرخۆڵەیەکیش نەبوو، تەنها ئەوانەی ژێر کێردەکە نەبێت. کەسێکیش گوێی لە جیڕەی دەرگا نەبوو، تەنها لەو کاتە نەبێت کە کەوتبووە بەر لمۆزی دوا کلێپە. چونکە میللەتەکەی من لە هەمان کاتدا دەرگان و لە هەمان کاتیشدا تەوێڵە و مێگەلی بەرخۆڵەن.

10

خوێنی بێگەردترین عیشق * بەئەرخەوان دایپۆشیم
کامەرانی هەرگیز نەبینراویش * ڕەشایی تێگرتم
برۆنزیشم لە ژێر شەپقەی * شێدار

دایکی ئەبەدیم لە دوور * گوڵاڵە و مێخەکم

لە قووڵایی دەریا بۆسەیان بۆ نامەوە * چاوەڕوانیان کردم
بەکەشتییە سێ ستوونەکەیان گوللە بارانیان کردم * کوشتمیان
هەموو تاوانەکەم هەر ئەوە بوو * منیش خاوەن عیشقی خۆمم
دایکی ئەبەدیم لە دوور * گوڵاڵە و مێخەکم

ڕۆژێکی مانگی گەلاوێژ * وریا بوونەوە
چاوە زۆر شینەکەی * لە قووڵایی دڵی غەمگینم
بەهۆی ئەوانیشەوە ژیانی * هەڵنەگەچراو ڕۆشن بووەوە
دایکی ئەبەدیم لە دوور * گوڵاڵە و مێخەکم

لەو ڕۆژەوە لەسەر سەرووی من * دان گیر کرا
سزای چەرخەکان * هاواری دەکرد: «ئەوەی
کە لە ناو خوێن دەتبینی * با لە نێو بەردیشدا بژی»
دایکی ئەبەدیم لە دوور * گوڵاڵە و مێخەکم

بەمە، خۆم لە ناو نیشتیمان * دەناسمەوە
لە نێو ئەم بەردانە، گەورە بووم * گوڵی خۆمیش پێشکەش کرد
بەڕووناکی * گەردنی خوێنی پیاوکوژانم ئازاد کرد
دایکی ئەبەدیم لە دوور * گوڵاڵە و مێخەکم



XV

خودایە، تۆ ئەمەت ویست، بەڵام ببینە: هەمان شتت دەدەمەوە
لێبوردن - نازانم چییە،
نوێژم - ناوێ،
لە کونجی تاریکیی، وەکو چەو مامەوە.
چی، چی، چی ترم بۆ دادەهێنێ؟
کاتێک بەرەو باوەشی تۆ دەچم، کۆچی گەرمیان و کوێستانی ئەستێرەکانە
ئەگەر بێت و کازیوە،
ڕێم بەرەو تۆڕەکانی ئەو دیو دەریا وەرچەرخێنێ،
تۆ ئەمەت ویست!
تەپۆڵکە و شارە ئاوییەکان و باغ و بێستان
لەناو بادا موتروبەم کردن
ئەگەر بێت زەنگ بەنیانی لە نێو سپێدەدا بۆمی بخواتەوە
تۆ ئەمەت ویست!
ئەگەر لە نێو گیادا سەوز بم و لە نێوانیاندا وڕێنەم بنووسمەوە
ئاخ زۆر بەچالاکی جارێکی دیش لە
ژێر ماشێتی(١) گەڵاوێژدا دەژاکێ
تۆ ئەمەت ویست!
چی تر، چی تری تازە، چی ترم بۆ دادەهێنێ؟
تۆ تەنها هەر قسەت دەکرد، دەبینی، بۆ ئەوەی تەحقیقی خۆم بکەم؟
بەرد لە قەڵماسنگەکەم بەردەبێتەوە و دەکەوێتە تەوقی سەرم.

(١) جۆرە شمشێرێکی ئەمریکای باشوورە. (وەرگێڕ)

بیری کانەکانم زیاتر هەڵکەند و گومەزیشم داوەتە بەر پاچ.
باڵندەکان ڕاو دەکەم و لە ژێر بارستاییان ون دەبم.
خودایە، تۆ ئەمەت ویست بەڵام ببینە: هەمان شتت دەدەمەوە.
ئەم توخمانەی کە تۆن،
شەو و ڕۆژ،
ستارە و ئەستێرەکان، هێمنیی و ڕەشەبا
ئەگەر بێت و نیزام بشێوێنم و دژ بەمەرگی تایبەتی خۆم
ئاوەژوویان بکەم
تۆ ئەمەت ویست!

XVI

بەرەبەیان شەهەوەتم لە خەو کرد،
بەرەبەیان چنارەکەی داگیرساند
بەدەستی پێشەوەم گەیشتمە قەراغی دەریا
لەوێ بەتەنها ڕاستم کردەوە:
فووت کرد و گەردەلوول ئابلۆقەی دام
یەک بەیەک باڵندەکانت بۆ ئەفسووناوی کرد –
خودایە بانگت کردم، چۆن لە دەستت هەڵبێم؟
سەیری مانگ و ساڵانم کرد لە داهاتوو
خولەکانی بەداخەوە بەبێ من دەگەڕێنەوە و
هەندە قووڵ گازم لە خۆ گرت
کە هەستم کرد خوێنم لە سەر خۆ بەرەو بەرزایی هەڵدەگژێ و
لە داهاتوومدا دادەچۆڕێ.
کونێکم لەسەر زەوی کرد لەو کاتەی دەچوومە پێستی تاوانبارەوە و



بەلەرزینەوە قوربانییەکەم لەسەر دەستم بەرز کردەوە و
لەگەڵی بەدەنگێکی زۆر ناسک قسەم کرد و
بەهێواشی چاوەکانی کردەوە و خوناو
دادەچۆڕییە خوارەوە لەو شوێنەی کە چوومە پێستی تاوانبارەوە.
تاریکییم ڕژاندە سەر ڕایەخی ئەڤین
لەگەڵ شتە ڕووتەکانی جیهان لە مێشکمدا
تۆماوەکەم هەندە دوور و بەهێز ڕاوەشاند
ژنان زۆر لە سەرخۆ ئاوڕیان بەرەو هەتاو دایەوە و ئازاریان کێشا و
جارێکی دیش بینراویان بوو.
خودایە بانگت کردم، چۆن لە دەستت هەڵبێم؟
بەرەبەیان هەندێ لەززەتم لە خەو کرد
بەرەبەیان چنارەکەی داگیرساند
بەدەستی پێشەوەم گەیشتمە قەراغی دەریا
لەوێ بەتەنها ڕاستم کردەوە:
فووت کرد– هەناوم تووشی موچڕک هات
باڵندەکانیش یەک لە دوای یەکم بۆ گەڕانەوە!

11

بەتەنها شین دەبم * سروودی سەوزیی تێروتەسەل
بەلەخۆبوردییەوە سەرنج دەدا * یاسای باڵندەکان
بەرەو تەهلیلەی دارهەنجیر * بەناو شەوی کۆتایی هاتوو ڕەوت دەکەم
ئاونگی زۆرم * لەناو بەروانکەکەم کۆ دەکەمەوە
لاژەوەرد * تۆڵەکە مێخەک
لەو ئاوە بەخشندانە * دادەگیرسێنم

دڵۆپەکان * منی هەرە بەخشندە
ئیقۆنەکانیش * کیژۆڵەی بێگەردم دەبن
بەزەریا پۆشاکی * بەتاقە کەتانی کەف
لێیان دەپارێمەوە * عەریزەی ڕێحانەم چنگ کەوێت
لە بەرائەتی منەوە و * دەمارەکانی پڵنگ
خشۆک * ترش و ڕەنگ پەڕیو
لە نێو هێزی سینەم * هەمووی دەخنکێنم
منیش بۆ هەمیشە * هەرە بەهێزتریان

زەمەنەکان هەڵدەگرن * گوناهە بێ ئەژمارەکان
قاچاخچی شەرەف * پەشیمانی چەکوش وەشاندن
بوسێفالی[٢] خوێن * ئازادە و وەکو شێت هەڵمەت دەبات
ئارەزووە سپییەکانم * شیربیە و پێشێل دەکات
ئازا * ڕووناکی عیشق
بۆنوبەرامەی توانا * لە ناویانا پرخەی دێ
دەحیلێنێ * هەرە بەتوانا

بەڵام لە دەوروبەری سەعات شەش * لەیلەکە مەزنەکان
کاتێک هۆشم لە زەمەن دا * دڕک بەدرزی خۆی دەکات
یانزەمین تەماشاکردنی فرمان * ئاو ئەستێرەڕێژ دەکات
جیهانیش نابێت * یا دەبێت
زاینی * جادوکەری ئەبەدی
بەگوێرەی ئەوەی * کە ڕۆحم مافی دەبێ
جاڕ درا * من ڕاستی ناو ڕاستانم

(٢) جۆرە مارێکە. (وەرگێڕ).





## پێغەمبەرایەتی

چەند ساڵێک دوای ئەوەی لە کلێسەکانیان گوناهیان بەفەزیلەت ناوبرد و پیرۆزباییان لێی کرد. شوێنەوارە کۆنەکانی ئەستێران و سووچەکانی ئاسمانی پڕ لە تەونی جاڵجاڵۆکە، زریان هات و ڕاپێچی و ڕۆحی ئینسانی لێوە پەیدا کرد. حیسابی خۆی لە گەڵ بەرهەمی سەرکردە کۆنەکان پاک کردەوە، گەورەی هەموو موچڕکی بەلەشا دێت.

گرمەیەکی بەهێز لەسەر دۆزەخ دەتوێتەوە و دیوارەکە لە ژێر بارستایی هەتاو دەڕمێتە سەر یەک. کێ ئیتر کەفوکوڵی قینی هێور دەکاتەوە و وەکو ئاماژە کە کات هات و بۆ تۆڵەسەندنەوە لە خەون. پاشانیش دێتە زمان و دەڵێ: شاعیری تاراوگە، لە چاخەکەت دا، بڵێ، چی دەبینی؟

– میللەتان دەبینم، جاران بەبەرەوڕووبوونەوە ئاوسا بوون، تور هەڵدرابوونە نێو زەردەواڵە و کێڵگەی گەزەنگ.

– تەور دەبینم پەیکەری ئیمپراتۆرەکان و سەرەک جاشەکان دەپەڕێنێ.

– بازرگانە فێڵبازەکان دەبینم چۆن دەچەمێننەوە و نرخی تەرمی خۆیان وەردەگرن.

– یەکگرتووی بیر کردنەوە نهێنییەکان دەبینم.

چەند ساڵێک دوای ئەوەی لە کلێسەکانیان گوناهیان بەفەزیلەت ناوبرد و پیرۆزباییان لێی کرد. بەڵام پێش ئەمە، ئا ئەوەتا لە چوارڕییاندا نێرگسە جوانەکان چییان بەسەر دێت، فیلیپەکان و ڕۆبێرتەکان چییان بەسەر دێت. ئەنگوستیلەکانیان بەبەرەواژ لە پەنجە دەکرد، قژیان بەبزمار شانە دەکرد و سینگیان بەسەری مردووان دەڕازاندەوە، بۆ ئەوەی ئیغرای ژنان بکەن. ژنانیش ئەفسووناوی دەبن و خۆ دەدەنە دەستەوە. بۆ ئەوەی

قسە بێتە دی و ئەو ڕۆژەش نزیک بێتەوە کە جوانی بدرێتە مێشی ئاگۆرا[٣]. لەشی سۆزانیش توانجی لێدرێت لەبەر ئەوەی شوێنی دیکەی نییە بۆ ئەوەی ئێرەیی پێدا ببەن. سۆزانیش خۆی دەسنیشان دەکات بەمودەعی گشتی حەکیم و مەزنەکان، ئەو تۆماوەی کە هەڵیگرتبوو، بەشایەد دەبات. بەقێزلێهاتنەوە، غوباری نەفرەت لەسەر خۆی دەتەکێنێ، بەرەو ڕۆژهەڵاتی ڕووناکیش دەست درێژ دەکات و هاوار دەکات: شاعیری تاراوگە و لە چاخەکەتدا، چی دەبینی؟

– لە سەر بناغەی پیرۆزی عەقدی مەدەنیمان ڕەنگی ئیمێت[٤] دەبینم.

– میرتۆ بچووک دەبینم، ڕاهێنەری سکینۆز، لە ئاگۆرا لەگەڵ حەوز و پڵینگ لە ناو مەڕمەڕ تاشرا.

– لە یانەسیبی ژنومێرداندا، هەرزەکارز و کیژان دەبینم.

– لە بەرزایی، بەهەڵواسراوی لە نێو ئەتیردا، پەرستگای باڵندەکان دەبینم.

شوێنەوارە کۆنەکان ئەستێران و سووچەکانی ئاسمانی پڕ لە تەونی جاڵجاڵۆکە، زریان هات و ڕاپێچی و ڕۆحی ئینسانی لێوە پەیدا کرد. بەڵام پێش ئەمە، سەیر کە وەچە گاسنی خۆیان دەچەقێننە ناو خاکی نەزۆک. سەرکردەکانیش مێگەلی خۆیانیان بەنهێنی هەڵبژارد و جاڕی شەڕهەڵگیرسان لێ دەدەن. جەندرمە و حاکمە سەربازییەکە تێروتەسەڵ سەرخۆشیی خۆیانیان دەخواردەوە. بەسەر پشتی کەشتییە بەیداغدارەکان و کەڕەنای سەرکەوتیش ڕێگاکانی دەشڵەژاند، لە بالکۆنەکانەوە گوڵیان دەباراندە سەر سەرکەوتوو. مەبەست لەوەیە کە لە ناو بۆگەنی لاشەکاندا دەژیا. تەرمگاکەشی لێوە نزیک بوو، زاری شەوەزەنگ بەقەدەر ئەو کرایەوە

(٣) مەیدانی گشتییە: کۆمیتەی سیاسی لە شارەکانی (Agora)، لە یۆنانی کۆندا دەگێرا. (وەرگێڕ).

(٤) چیایەکە دەکەویتە باشووری ئەسیناوە. (وەرگێڕ).



و هاواری کرد: شاعیری تاراوگە لە چاخەکەتدا، چی دەبینی؟

– دادگای سەربازی دەبینم وەکو مۆم دەڕمێتە سەر سفرە گەورەکەی قیامەت.

– جەندرمە دەبینم بەرامبەر بەبێگەردیی ئاسمانەکان، بەخوێن دەسنوێژ دەشۆن.

– شۆڕشی هەمیشەیی دارودرەخت و گوڵ و گوڵزار دەبینم.

– گەمی پڕ چەک و تفاقی خۆشەویستی دەبینم.

حیسابی خۆی لەگەڵ بەرهەمی سەرکردە کۆنەکان پاک کردەوە، گەورەی هەموو موچڕکی بە لەشا دێت. گرمەیەکی بەهێز لەسەر دۆزەخ دەتوێتەوە و دیوارەکە لە ژێر بارستایی هەتاو دەڕمێتە سەر یەک. بەڵام پێش ئەمەش، لاوان حەسرەت دەکێشن و بەبێ هۆ، پێش کاتی خۆشی، خوێنیان بۆگەن دەبێت. قژبڕاو، مەحکومکراوان مەنجەڵیان دەکەوتە قەد شیشەکان. کارگەکانیان چۆڵ کرد و بەفرمانیش جارێکی دیش پڕی دەکەنەوە بۆ ئەوەی هەزارەها خەونی موعەلەبی تیا بەبەرهەم بهێنن و سروشتیش بەهەموو جۆرێک بخەنە شووشەوە. پاشان سالانی ڕەنگ زەرد و ژاکاو دێن، بەبرینپێچ دەوردراو. هەر یەکە و چەند گرامێک بەختیاری چنگ دەکەوێت. شتەکانیش وێرانی جوانیی بۆ دەنێنەوە. ئەو کاتیش، لەبەر ئەوەی شاعیر تاراوگەی دیکەی نییە کە تیایا حەسرەت بکێشێ، بەسینەی کراوەی تەندروستی ڕەشەبا بەرەڵا دەکات، دەگەڕێتەوە نێو وێرانە و لە ناوەندی جوانیی هەوارگەی خۆی چێ دەکات. یەکەم وشەی دوا مرۆڤیش ئەمە دەبێ، بەگیا بلێ سەوز بەو بەژن بلێ لایە ڕووناکەکەت وەکو هەتاو دەرخە. سەرلەنوێ، ژن دەپەرستێ و لە ناو کا هەر وەکو چۆن نووسرا، ئەوها دەیخەوێنێ. خەونیش تۆڵەی خۆیان دەسێننەوە و وەچە لە چاخەوە بەرەو چاخ دەچێنن!

12

ئا ئەوەتا دەمم دەکەمەوە * زەریای کەفاوی شکۆفە دەکات
وشەکانم وێنجەیان * لە ئەشکەوتە تاریکەکانیان هەڵگرتووە
بەگۆلکە بچووکە دەریاییەکان * پێشانی دەدات
ئەو شەوانەی کە لە * سەر کەساسی ئینسان دەناڵن

ئەواتان دەمارە بڕاوەکانم * و خەونیش لە هەموو لایەک مێخەکینن
دەبنە چەرخوفەلەک * بۆ مناڵانی جۆگەلە
دەبنە چەرچەف بۆ کیژانی * هۆشیار
سۆلۆ(٥) بەنهێنی * بۆ عیشقی ئەفسووناوی.
لە شێڤروفۆیە(٦) قورسەکانەوە * دابەزیمە ناو باخچە شینەکەم
بۆ ئەوەی لە مردووان هەڵبێم * تەرمە ئەفسووناوییەکان
دەرزیلە زێڕینەم * لە خیانەتیم دووکەرت کرد
لە کۆتاییدا ئەستێرەکان * بۆ ئەبەدییەت تاریک هەڵدەگەڕێن

چەکە ئاسنینەکان ژەنگ هەڵدەهێنن سزام دان * سەرەڕای ئەوەی لە سەردەمی خۆیان
منێک کە هەمیشە ئازارم چێشت * هەزارەها چزووی تیژ
دەمەوێ بەوەنەوشە و نێرگس * بهۆنمەوە
درەوشاوەترین خەنجەری نوێ * کە لە قەدی قارەمان بێت

(٥) پارچە مۆسیقایەکە یا گۆرانییەکە بەتەنها دەوترێت. (وەرگێڕ).
(٦) (chévrefeuille) جۆرە گوڵێکی سووری بۆنخۆشە، خۆرسکە و لە باخچەش دەڕوێت. (وەرگێڕ).



سنگم ڕووت دەکەمەوە * با لە سەودایی خۆی ئازاد دەکرێ
کەلاوە کۆنەکان ڕادەماڵێ * هەر وەک ڕۆحە وێرانەکان
بەپەچە ئەستوورەکەی تەمەوە * زەمین خاوێن دەکاتەوە
بۆ ئەوەی باخچەی لەززەت * مان بۆ بدۆزێتەوە.

XVII

بۆ ناو دڵی کێشوەرێکی بێتاوان و دوور، هەر ئێستا ڕۆ دەچم
ئێستا خۆم لە بوونەوەرە هەواییەکان دەپارێزم
لە قژە ڕەنگینەکانی کازێوەی باکوور
لە پێستی کەتانی دەریاچە زێڕینە ناسکەکان.
بەدابەشکردنی کاوە هەنگاو دەنێم، گرمۆڵە و
هەناسەم بەسەر خاکا بڵاو دەبێتەوە
دوا هەوداکانی وەنەوز.
درەختەکانیش بەتەنیشتمەوە ڕێ دەکەن، بەرەو ڕووی با بەرز دەبنەوە.
غەیبی مەزن و دژوار بەیەک دەبینم:
حەوز دەوری گڵکۆی هێلینی داوە.
درکی سێدان و دولفین دەوری هێمای خاچیان داوە.
دەرگای ئەفسووناوی تەڵبەندە گوناهبارەکان.
لێرەوە بەناو شکۆمەندییدا هەنگاو دەنێم.
ئەو وشانەی کە غایەنەتیان لێکردم و ئەوانەی شەپازللە بوون
دەبنە ڕێحانە و لقە دارخورما:
سوپاس بۆ خودا، بۆ ئەو کەسەی کە دێت دەچرپێنن!
شەهوەتی میوە: ئەوها ڕۆژووگرتنم بۆ دەرکەوت.
دارزەیتوونە لارەکان، بەرامبەر بەو برووسکە شینەی نێو پەنجە

سەوزەکانیان چەمییەوە:
ساڵانی ناخۆشی لە نێو شیشە ئاسنینەکان.
کەناری هەتاهەتاش، لە لایەن شێی سیحراوی چاوە جوانەکان
ئەفسوونی لێکراوە:
خەرەندی مارینا.
بەم ڕۆحە بێگەردەوە بەرەو کوێ بڕۆم.
ئەو گریانانەی کە غایەنەتیان لێکردم و ئەوانەی ئابڕۆچوونیان تیا
حەشاربوو
دەبنە هەناسە و باڵندەی نەمر:
بەچرپەوە دەیگۆ سوپاس بۆ خودا، بۆ ئەوەی کە دێت!
بۆ ناو دڵی کێشوەرێکی بێتاوان و دوور، هەر ئێستا ڕۆ دەچم

XVIII

لەمە بەدواوە بەرەو کێشوەرێکی هێمن و دوور هەنگاو دەنێم
خۆم لە جوانیی لاوی شین و
لە ئەسپە بچووکە بەردینەکان دەپارێزم
لەگەڵ ڕەوڕەوەی هەتاو لە سەر پانتایی هەنیەیان.
ریزە ڕێحانە ناسیمیانەوە
لەو کاتەوەی کە لە ناو ئیقۆنی ئاودا هەڵلەرزیم،
قەدووس، قەدووسم دەوتەوە.
سەرکەوتوو بەسەر هادیس و قوتارکەری ئەڤینە،
ئا ئەوەتانێ، ئەمە ئەمیری لەیلەکە.
لەگەڵ گەڕانەوەی چەند شەماڵێکی کرێت دا،
بۆ ساتەوەختێک خۆم بینی نیگاریان کێشام.



بۆ ئەوەی زەعفەرانی عەدالەت لە لایەن ئەتیرەوە بگەڕێتەوە.
ئیتر لەمە بەدواوە یاسا ڕاستەقینەکانم لە ناو درزی دیواری
گەچین
دەشارمەوە و
خۆم بەتەواوی دەدەمە دەستی ئەوەوە.
پێتان دەڵێم، بەختیارن ئەو کەسانەی کە پاکیزە ڕاڤە دەکەن.
بەدان ئەو هێشووانەی کە مەست کەرن دەتەقێنن،
بەسەر سینەی بورکانەوە و لە ناو ڕەزی مەریەمەوە.
تەماشاکەن، تەنها هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە کە بەسەر ئەو
ڕێگایەدا بڕۆن کە من
دەسنیشانم کرد!
لەمە بەدواوە بەرەو کێشوەرێکی هێمن و دوور هەنگاو دەنێم.
لەمە بەدواوە دەستی مەرگە
میهرەبانی ژیانمان پێ دەبەخشێ و
وەنەوزیش نەما.
زەنگی نیوەڕۆ زەنگ لێدەدات و لێدەدات
لەسەرخۆش لەسەر بەردی داغ بوو ئەمە نووسرابوو:
بۆ ئێستا و بۆ هەتاهەتا ستایش بۆ ئەو.
بۆ ئێستا و بۆ هەتا هەتا باڵندە بەجریوەوە:
پیرۆزبایی لە بەهای پیرۆز.

## تەهلیلەی سبەینان

پیرۆزبایی لە ڕووناکی و لە نوێژی یەکەم
کە مرۆڤ لەسەر بەرد تۆماری کرد
لە هێزی ئاژەڵ کە ڕێگای بەرەو هەتاو کردەوە
لە ڕوەک کە جربوەی هات و لە پرێکدا ڕۆژ پەیدا بوو

لە کەنار کە نوقم دەبێت و گەردنی دەردەخات
لە ئەسپێکی بەردینی زل کە زەریا غارغارێنی پێ دەکا
چەندین دەنگی شینی وردیلە کە هەزارەها شمشاڵی لێ دەزێ
سەرە سپییە بەتواناکەی پۆسێئیدۆن[1]

پیرۆزبایی لە دەستی پیرۆزی گۆرگۆن[2]
دەبینین لایەنگری چارۆگەدار و بەقوتارکەر دەچێت
بەوەش دەچێت نەزر ببەخشێتە با
بەوەش دەچێت بپرسێت ئەرێ جێتبهێڵم یا نە ء

ئەڤینی شینەشاهۆ لەسەر قوتەی کلێسا
وەکو لیمۆ ئاسا لە سەعات نۆی سەر لە بەیانی
چەوێکی موتلەقی زێڕین لە دڵی قوولایی
کێڵگە و گوێسەوانە، بەلاژەوەردی سەوزباو زەرکەش

با کاهینە فاڵچییەکان کە نوێژ ساز دەکەن

(١) خوداوەندی زەریایە لای یۆنانییە کۆنەکان. (وەرگێڕ)
(٢) مەبەست لە گوڵی دەریایە. (وەرگێڕ)



وەکو مادۆن زەریا لە پانزەی خەرمانان بەرز دەکەنەوە
کە فوو و ئاگر دەنێنە ڕوومەتی پرتەقاڵەوە
کە فیکە بۆ چیا لێدەدەن و ئا ئەمەتاش

پیرۆزبایی ڕاهیبە بچکۆڵەکان بەخۆیان و چەناگە سپییە زریانییەکەی
ڕاکردووانی کە هەزارەها لاژەوەردیان تێپەڕاند
موریدەکانی ئارمێس بەکلاوە قیتەکانیانەوە و
قەڵەنگە دووکەڵییە ڕەنگ تێرەکانیان

بای باکوور، بای سەبا، بای دەبوور
ڕۆژئاوا، گرێگۆس، بای باشووری ڕۆژهەڵات
بای وەشت، بای باکوور

پیرۆزبایی لە مێزە دارینە سادە ڕەنگ کاڵەکە
لە شەرابی زێڕین لە کراسی پاگژی هەتاوی
لە گەمە ڕۆشنەکانی دەریا لە بنمیچ
بۆ گوڵی فیلۆدێندرۆن وریا لە سووچی خۆی

لە هەیوان و شەپۆڵ دەست لە ناو دەست
پێ پەتی کە حیکمەت دەبەخشێتە لم
دەنگی زیگزیگەیەک لە ناو هەزاران دیارە
هۆشیاریش تا بڵێی ڕۆشن هەر چەشنی ڕۆژێکی هاوین



PDF 4 KURD

پیرۆزبایی لە گەرما کە بەسەر جۆگەلەدا
کڕ دەکەوێ لە ژێر کەوانە بەردە نایابەکان
کخەی زارۆلان بەمێشی زێڕینی سەوزباوەوە
زەریایەک ئەویش سەوز و بێکۆتایی دەدرەوشێتەوە

لە شانزە ماسیگر کە تۆڕەکانیان رادەکێشن
لە نەورسە وێڵەکان بەملاو ئەولادا دەفڕن
لە غەڵبەغەڵبە تەنها جودابووەکان
لە سێبەرێکیش بەنێو ئەستوورایی دیوارا تێدەپەڕێ

لە دوورگە زەنجەفەرییەکان و بەدووکەڵ ڕەشداگەڕاوەکان
ئەو دوورگانەی کە خشۆکێ کە ناوی زیوسە تیایا دەنوێ
دوورگەکان بەخۆیان و جبەخانە و حەوزە ڤاڵەکان
دوورگەکان کە بورکانی لاژەوەردی سازگاریان تیا بۆ خواردنەوە

ئەوانەی کە لە میلتەمن کە چارۆگەکانیان ڕەنگینن لە بەر بای
سەبا
ئەوانەی بەردەم بای دەبوورن چاپووک و چالاک ڕێدەکەن
کە کەف بۆ هەموو سەفەرەکە سپی هەڵگەڕاندووە
بەچەوی وەنەوشەیی – شین و گوڵی زەریا نەخشینە

سیفنۆس، ئەمۆرگۆس، ئەلۆنیسۆس و
ئاسۆس و ئیتاکا و سانتۆرین و
کۆس و ئیۆس و سیکینۆس



پیرۆزبایی لە بەرزاییبیە بەردینەکە
دەڕواننە زەریای میرنۆ ڕێک و ڕەوان بەرامبەر بەڕووناکی
هەر وەک ژمارە 8 ی زۆر شەنگ یا وەک گۆزە
لە ناو دەستێکیشی پووشی سپێدە

نیوەڕۆی کون کونی پاکیزە بەرز دەبێتەوە
گەندەمووی بەدەست چنراوی وەنەوز کە بەرز دەبێتەوە
تیشکدانەوەی زێڕ کە لە ناوەند کۆڵەگەی قورسدا بوون
ئەسپە شێیەکەی و چەمووشەکەی کە هەڵدێت

لە قەدی درەختە کۆنەکەی زەمانی ئێراوە
جەنگەڵە لۆرییەکە بۆ هەتاهەتایی ڕووناکی دەخواتەوە
خانوویەک هەر چەشنی لەنگەرێک لە قووڵایی خەڕەندا
پێنێلۆپ خان خۆی تەشییەکەی کە لە داری زۆڤا دروستکراوە

لە کەنارەکەی دیکە باڵندەی بۆسقۆر هەن
دارترنجێک نوک تیژ لەو شوێنەی کە ئاسمان بلاودەبێتەوە
گوێی لاژەوەرد سەوز هەڵگەڕاوە تا نیوە نوقمی دەریا بووە
سێبەری درێژبش بزوێن هی حۆرییەکانی زەریا و سیکۆمۆرەکان[٣]

پیرۆزبایی بۆ ئەو کەسەی کە ئاهەنگی یاداشتی سالڕۆژی
دوو پیر هی کیریکۆس و ژولیتیس دەکاتەوە

(٣) جۆرە درەختێکە کە هەنجیری فیرعەونیشی پێ دەگوترێت، گەڵای پانی هەیە. (وەرگێڕ).

موجیزەی ئاگرێک لە هەوای ئاسمان دەدات
کەشیش و پاساری هەر دووک پێکڕا گۆرانی دەچڕن:

سڵاو لە ڕەژوو، بەڵام سڵاو لە سەوزایی
سڵاو لە تۆ هەرزەی شمشیر لەدەستی سەر کەشتی

سڵاو لە تۆ کاتێ پێشدەکەوی تراوێلکە هەڵدەوەرن
سڵاو لە تۆ کاتێ لە خەو هەڵدەستێی موجیزە دەبووژێنەوە

سڵاو لە کێوییەکانی قووڵایی بەهەشتی هێمن
سڵاو لە پیری دێری دورگەکان

سڵاو لە مەریەمی خەون سڵاو لە ژنی زەریا
سڵاو لە تۆ هەڵگری لەنگەر خاوەن پێنج ستارە

سڵاو لە جوانیی قژ سەربەست و لەرینەوەی زێڕینی با
سڵاو لە جوانیی زمانی ورووژە و شەیتانی نووستوو دەستەمۆ دەکات

سڵاو لە تۆ کە کتێبی سەعاتی باخچەکان بەرێوە دەبەیت
سڵاو لە تۆ کە هەر دوو پەرچەمی ئۆفیکوست[٤] لە کەمەر داوە

سڵاو لە شمشێر وەشێنی ڕاست و شەرمن
سڵاو لە گومرا و لە پێغەمبەرایەتی

پیرۆزبایی لەو خاکەی کە

(٤) ئەستێرەیەکە تێکهەڵکێشە لەگەڵ ئەستێرەی ماسی، هەندێ جار ماریشی پێ دەوترێ. (وەرگێڕ).



بۆنی بلاچە تێکەڵ بە بۆنی گۆگرد دەبێ
ڕەحمی چیا کە تیایا مەرگ چەکەرە دەکات:
گوڵی داهاتوو

لە یاسای غەریزە کە هەرگیز دوو دڵ نییە
لە ترپەی چالاکی سۆلیستی ژیان
لەو بەردە خڕەی خوێنە قرمزییە، ئەم هاوچەشنی هەتاوە
لە لاولاوانەی کە فڕەفڕ لەسەر زستانان دەکەن

پیرۆزبایی لە قالۆنچە- لەدەرگادەری بەرێز
لە نانە شەرمنەکانی ناو لەشی تەزبوی هەتاو
لە بانەمەڕ کە دۆناودۆنی سێکس دەگووشێ
لە سەرچاوەی کە چەکەرە تازە شکۆفەی کردووە

گالێسکەکە وڕکن بەلایەکا چەماوەتەوە
لە مێشێکی زێڕین کە پاڵ بەئاگری داهاتووەوە دەنێت
بەگوڵی ئاو ئەم خوێنبەرە سرکەی کە ترپەترپ دەکات و
بەهۆی ئەوەوە گوڵی گاردێنا دەژیت

گوڵە شیرینەکان مێوانی نوستالژی
گوڵی ناسکەکان میراتگری ئاون، کە بچکۆڵە
چوارپێیەکانی سەر ڕچە هەڵدەلەرزێنێ
تێکەڵ بووە گەورەکانی هەتاو یا بەڕاژەنراو بە خەون

شەرمنەکان بەخۆیان و ئەموستیلە سوورەکەی عیشقیانەوە
تێکهەڵکێشە بەفیزەکانی ناوەند کێڵگە
ئەوانەی کە بەگەوهەری بێگەردی ئاسمان شێلران

راماوەکان و ئەوانەی بە وەهم چنراون
لیس و گوڵەباغ و یاسەمین
وەنەوشە و لەیلەک و سونبول
ئەستێرە و نێرگس و وەنەوشەی سێپەلک
پیرۆزبایی لە تەمی ناوەند لەوەڕگا
لە نزیک قوولەقاپی تەڕبوو فرتەی قومقمۆک
مینیزیاریێت و تەماشا قووڵەکەی
بەبێ ئەوە بەرخۆڵە بێت گەردن ئازاد دەکات
لە زەنگوڵەوە با زمانی زێرین خاو دەکاتەوە
ئەو سوارچاکەی کە هەندە نابات لە ڕۆژئاوا ون دەبێت
ئەوەی تریش سوارچاکی مەعریفەیە کە
وەکو دەسکێشێ زەمەن کرۆژتبێتی، دەگەڕێتەوە
بەشەوێکی پووشپەڕ هودنە شینباوە
یاسەمین و کراس بەدڵی خۆیان لە ناو باخچە پەرتن
گەلحۆیی ئەستێرەکان بەرز دەبنەوە و بەرز دەبنەوە
دوا ساتی دڵخۆشیی کە پێش فرمێسک دەکەوێت
تەنها گرێیەک لەسەر دڵە و باسیشی ناکەین
هەر وەکو شووشەی پەنجەرە فەزیلەی ئارێتوس[٥] بەتاڵ دەکات
عیشقیش لە بەرزترین ئاسمانەوە دادەبەزێ
پاڵتۆی مێخەکینی لەبەرایە

کچان ئەو کایەی کە بەئویتۆپی بۆندارە
کچان ئەستێرە چلچرا ونبووان گومڕاکەران

(٥) حەوزێکی بەناوبانگی دووگەیەکە بەهەمان ناوەوە(وەرگێڕ).



کچان کەشتیی هەموو غەیبەکان
لەبەر کەمال چەماونەتەوە و بەڵام ڕۆچوونیشیان سەختە

ترشیی لە نێو شەوزەنگ بەڵام سیحراوی
لایەکی لە نێو ڕووناکی بەڵام تاریک
وەکو فەنار بێوچان بەدەوری خۆی دەخوولێتەوە
هەتاو خۆرەکان و سوار مانگ بووەکان

هێرێس، میرتۆ، مارینا
هێلین و ڕۆکسان و کلێر
ئانا، ئەلەکسەندەر و سینثیا

کڕکەوتنی شلەتێنی چرپەچرپ لە دڵی سەدەف
ئەو جوانە ونبووەی چەشنی خەونە: ئەرنیۆتا
پزیسکێکی دوور کە دەڵێ: بخەوە
ماچی تێکهەڵکێش بوو وەکو درەخت لە جەنگەڵا

چمکی کراس دڵخۆشە بەوەی قەپ لە شەماڵ دەگرێ
گەندەموو شەیدایە، مەست و حەیرانی پووزە
خوێباوی بۆنداری وەنەوشەی سێکس
ئاوی فێنکبەخشی مانگی چواردە

پیرۆزبایی لە ڕوفرانەی[٦] کە لە دووڕا دێت

(٦) ئەو دێڕەیە کە هەمیشە لە گۆرانییەک یا لە شیعرێکدا دووبارە دەبێتەوە. (وەرگێڕ).



PDF 4 KURD

له ویسگەی فێنکی هێلین و خوی تاڵە شەپۆڵە شەنگەکەی
هەنجیره داچۆڕاوەکانی ژێر باڵی هەنجیره هیندییەکان
کەلاوەی داهاتوو و جاڵجاڵۆکەکانی

شەوی بێکۆتایی کە ڕۆدەچین بۆ ئەوەی دەست لە هەناری خۆ بدەین
کاژێر ئەم ئەشکگرەی کە بێ بایەخە
دۆشەکێکی ڕەش و دوای سەفەرە بێکۆتاییەکەی کەوتووە
بۆ قەراغە کەرخەکانی کەون

کەشتییەکان هەڵساونەتە سەر پاژنەیان
کەشتییەکان بزنە باکورییەکان
کەشتییەکانی بەردە قوتبییەکانی فڕێ دان و وەنەوز
کەشتییەکانی نیکۆتواس و ئێڤاندنێکان

ئەوانەی کە پڕ لە باو بوندوقی ئاتۆسن
ئەوانە کە بۆنی ڕنک و خەرنووکی کۆنیان لێوە دێت
ئەوانەی بەدەمامک هەر وەکو پیران بەڕەونەقن
ئەوانەی کە لە هەمان کاتدا نیشتەجێ و گەڕۆکن

ئەنژەلیکا ، پۆڵین، سێ ئەسقەفەکە
جوامێر، ئەلسیۆن، نۆکراتیس
مەراکیس، خواناس، ئەنۆنسیاد



پیرۆزبایی لە شەپۆڵ کە لەبەر سامناکیی سپی هەڵدەگەڕێ
پێنج گەز بەرز دەبێتەوە
قژ ئاڵۆزکاو و سیسارکە کەچەڵە دەگەڕێتەوە
خۆی دەکێشێتە زەریا و کاشییەکانا

پیرۆزبایی لە مارینا هەر وەکو جارانە
بەبێ کەللە توندڕەوی سەگانەی، بەبێ شەیتان
مارینا پارچەیەکی بێگەردی مانگە
مارینا بێ بەزەییانە کۆتایی جیهانا

کۆرنیشی کە بای باکووری وڕکن سواندۆنتی
کاهینی هەوران کە ڕا دەگۆڕێ
خانووە هەژارەکان یەک لە ناو ئەوی دیکە
بەتەوەزەلیی و لەززەتە چاوەڕوانن و خەواڵوون

روخسارێکی لاوازی غەمگینی بارانێ کە دەبارێ
دارزەیتوونێ پاکیزە بەقەد بناری گردەکەدا هەڵدەشاخێ
بەبچووکترین چرپەی هەورێکی داهێزراوی شارۆچکە
هێلکە شەیتانۆکەی ورد فلیقێنرایەوە

پیرۆزبایی لەو کەسەی تەنها و غەمگینە
لەو کەسەی پێش ئەوەی بێتە دونیاوە گومڕایە
شاعیر وەکو نەشتەرچی ئیش دەکات
گوێزانێکی لە وەسف بەدەر بەدەستی سێیەمییەوە:

چونکە هەر خۆی مەرگە و هەر خۆشی ژیانە
هەر خۆی شتی چاوەڕوان نەکراو ڕێکخراویش هەر ئەوە

ئەو گزنگی هەتاوە بۆ ڕووک، تەوەرە جەستە دابەش دەکات
ئەو خانووە لە شووشە، ئاگری مێشکە گوڕ دەداتە خۆ

هەر ئەو تویێنێتی پاش سەر لێدانی کانی
هەر ئەو جەنگی دوای ئاشتی ئاسایش

هەر ئەو ئیۆنە پشکێنەری شەپۆل و گێژبوونە
هەر ئەو پیگمالیۆنی گڕ و موجیزەیە

هەر ئەو فتیلەیە کە لە قەراغ لێوی قوڕین گڕ دەگرێ
هەر ئەو بیرێکی نادیارە کە باڵی دۆزەخ بە بەرەواژی وەردەگرێ

هەر ئەو دزی لەززەتە کە هەرگیز لە خاچ نادرێ
هەر ئەو مارێکی سفتە کە خۆی بەگوڵەگەنمی ڕەقەوە دەگرێ

هەر ئەو شەوەزەنگە، هەر ئەو شێتییەکی هارمۆنییە
ئەو جەوهەری بەهاری وەرزە ئاشکراکانە

پیرۆزبایی لە خانەنشینیی گورگ کە لمۆزی
بەرامبەر بەئینسان دەگۆڕێ و ئەویش بەرامبەر بەفریشتە دەیگۆڕێ



نۆ پەیژە کە ئەفلووتین توانی یەک بەیەک بەسەریا سەرکەوێ
شەقی بوومەلەرزە بەگوڵ پڕ کرایەوە

لاسکە ڕووناکی بەدەنووک لێدانەوە نەورەس دەسبەرداری بوو
هەر وەکو بێتاوانی چەو ڕووناک دەکاتەوە
هێڵ کە بەناوەند ڕۆحی دا تێدەپەڕێ
کە لە گەڵتا پرسەی بەهەشت دەگرێ

پیرۆزبایی لەو کەسەی کە پێش کەڕەنای
ئەشێرۆن پەیدا دەبییێت و جەستە قوڕ ئاساکەی سووتاوە
لە شیعری هەڵقرچاوی ژووری زایەڵەی مەرگ
بە وشە ئاسنینەکانی ڕم و خۆکوژییە

لەو ڕووناکییە حەمیمییەی کە وەک سپێدە
مینا وێنە و هاوچەشنیی هەتاهەتایی سپی دەکات
ئەو شاخانەی کە بەبێ ئەوەی سەدەف ببینن
هەموو سیمای ئەبەدییەتیان هەیە

چیا کە فیزیی کەلاوەی هەیە
چیایە شەکەتەکان، شیردەرە ئاوسەکان
چیا، ئەم شکێنەرانەی کە چاوی هەراشیان هەیە
دەرچە لە هەموو لایەک و لە هەموو لایەکیش چل گەوە

ئەوانەی وەک دێر پڕ نمەن

ئەوانەی کە لە ژێر تەمی بەرخۆڵە حەشارن
ئەوانەی کە لەسەرخۆ وەک پێی شوان ڕێ دەکەن
بەسوخمەیەکی کورتی ڕەشەوە و کراسێکی فش و گەورەوە

پاند، فۆدۆپ، پەرناس
ئۆلەمپ، تیمفریست، تایژێت
دیرفیسو ئاتۆس، ئاینۆس

پیرۆزبایی لە دەربەند کە لە بەرزایی دەکرێتەوە
رچەی چەرخ شین داگەڕاو بەرەو هەوران
ئەو دەنگەی کە تا دەگاتە دۆڵ شەیدایە
ئەو زایەڵە خاوەی وەک ڕێحانە ڕۆژ دەمژێ

تەڵاشی بەسەبری مانگا هێمنەکان کە
دارزەیتوونە قورسەکان بەرەو ڕۆژئاوا ڕادەکێشن
دووکەڵی خواروخێچیش لە ناو با
کاری ئینسان دەتوێنێتەوە

پیرۆزبایی ڕچەی گەرچکی ڕەنگ کاڵ
پڕ لە شتی رووخێنراو و قوژبنە تاریکەکانە
ئەو پەڕەیەی کە سپاردرایە ژێر خاک
ئەو گۆرانییەی کە لێری لە دۆزەخ دەیچڕێ

لەو دێوانەی کە لەسەر داری ئیقۆنەکان تاشراون



لە چنارە سپییە کۆنەکان، هەڵگری ماسی
کۆرێسە نازدارەکان بەخۆیان و دەستی بەردینییانەوە
مەمکۆڵەی هێلین هەر وەکو کەنار خەونی دەبینی

بانگاشەی ڕەوە درەختێک بەدزییەوە و گونجاوە
لەگەڵ ئەم نۆتە مۆسیقییانەی دونیاکەی دیکە
بۆچوونە کۆنەکەی کە بەگوێرەی ئەو
مەجهول وجوودی هەیە و لەم نزیکانەیە، بەڵام نادیار

سێبەر کە بەرەو خاک شۆڕی دەکردنەوە
تا لە گومانێکی زێڕینی یادوەرییان
سەمای ئارکایک و پیرۆزی سەر قەبران
حیکمەتێکیش نازاندرێ چەندە بەهای

دارزەیتوون، دارهەنار، دارهەڵوژە
سنۆبەر، چنار، دارپلاتان(٧)
داربەڕوو، ئێتر(٨)، سەروو

پیرۆزبایی لەم ڕۆندکە، ئەستێرەیەکی بێ هۆ
کە پزیسک لە سەرخۆ لە چاوانی جوانەوە تەعبیر لە خۆی دەکات

(٧) درەختێکی بەرزی گەڵا پانی قەد لووسە. (وەرگێڕ).
(٨) درەختێکی گەورەیە، نە وشکایی زۆری پێ خۆشە، نە سەرمای زۆریش، حەزی لە ئاووهەوای شێدارە. بەعارەبی «الزان»ی پێ دەوترێت. (وەرگێڕ).

هی منالان که دەست لە دەستن
هی منالان کە تەماشای یەکتر دەکەن و هیچ نالێن

هی دەمی تەتەڵەکردووی عیشقی سەر گابەردێک
فەنارێک کە غەمی ڕەشی هەزاران ساڵ هێمن دەکاتەوە
ورکی سیسارکەی شەو پەشیمانی دێنێتەوە یاد
شالێکی جێهێڵراوی نێو کزەبای ئێوارە

ئەم تفتی پونگەیەی نێو دانی یەکێک کە درۆی کرد
ئەو دوو لێوەی کە نەیانتوانی دانپێدانان چارەسەر بکەن –
بەڵام « ماڵئاواش» واتە هەندێک بریسکانەوەی برژانگە
لە پڕێکیش، هەموو گەردوون تاریک داهات

گەورەیی و سستی و بارستایی ئۆرگی باهۆز
ئەو زەمەنەی کە لە ناو دەنگی ئیراکلیتە کە ماڵوێرانی دەنێتەوە
رووەکەی تری پیاوکوژان، ڕوخساری نادیار
«بۆ» یەکی بچووک کە بەبێ وەڵام مایەوە

پیرۆزبایی لەو دەستەی کە بەرەبەیان هێشتا ئاڵە
لە کوشتارێکی سامناک دەگەڕێتەوە
دەشزانی لەمەودوا، لە هەققەتدا چ جیهانێک بەهێزترە
چ شتێک لە «ئێستا» دایە و چ شتێک بۆ «هەتاهەتایی»یە:

ئێستا ڕێحانەی کێوییە، ئێستا هاواری جۆزەردانە



بۆ هەتاهەتایی دوا هۆشیاریی، بۆ هەتاهەتایی درەختی درەوشاوە

بۆ ئێستا بۆ ئێستا تراوێلکە و بانتۆمیمی خەوی موقناتیزی
بۆ هەتاهەتایی بۆ هەتاهەتایی ئیستیعارەی ئەستێرەدار و کەشتی لۆگۆس

بۆ ئێستا هەوری شڵەژاوی شتە کاتییەکان
بۆ هەتاهەتایی ڕووناکی گێژەلووکەی نهێنییەکان

بۆ ئێستا توێکڵی زەمین و دەسەڵاتی موتلەق
بۆ هەتاهەتایی تێشووی ڕۆح و جەوهەر

بۆ ئێستا میلانکۆلی مانگی ڕەنگ زەرد
بۆهەتاهەتایی قاقلەجنۆکەی زێڕی شینی ئەستێرەی پزیسکهاوێژە

بۆ ئێستا میللەتان خۆ تێکەڵ دەکەن و ژمارە ڕەش
بۆ هەتاهەتایی پەیکەری داد و چاوێک کە هەموو شتێک دەبینێ
بۆ ئێستا ئاوا بوونی خوداوەندانە بۆ ئێستا سووتووی ئینسانە
بۆ ئێستا بۆ ئێستا عەدەمە و
بۆ هەتاهەتاییش گەردوونی تەنک، بەڵام ڕۆچوونی سەخت!

تاکو ئێستا ئەکسیۆن ئەستی تەرجەمەی ئەم زمانانەی لای خوارەوە کراوە:

فەرەنسا

-ODYSSEUS ELYTIS: AXION ESTI, Traduit du grec par Xavier Bordes et Robert Longueville, Paris, Gallimard, 1987.

ئەلمانیا

-ODYSSEAS ELYTIS: TO AXION ESTI (GEPRIESEN SEI), Deutsch von Günter Dietz, Humbourg, Claassen Verlage, 1969. Et: Frankfurt am Main, Fischer Verlag, 1981.

سوێد

-ODYSSEAS ELYTIS: AXION ESTI (LOVAD VARE), Isvensk tolkining av Ingemar Rhedin, Stocholm, Bonniers, 1979.

نەرویج:

-ODYSSEAS ELYTIS:VERDIG DET ER, Oversatt fra gresk av Tore Frost og Egil A. Wyller; Oslo; Cappelens Forlag, 1983.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا:

-ODYSSEUS ELYTIS: THE AXION ESTI, Translated by Edmond Keeley and Georg Savidis, Pittsburgh, University of Pittsburgh Press, 1974.

یۆگسلاڤیا:

-ODISEJ BLITI: IZABRANE PESME Izbor i prevod sa grckog ksenija. Maricki Gadanski, Eli Skopetea, Ivan Gadanki, Beograd, Dob; 1980.

ئەرجەنتین:

-ODYSSEAS ELYTIS: LO DIGNO. Traduccion por Elena Huber, Buenos Aires, Editorial Sudamaricana,1982.

ئیستیوانیا:

-ODYSSEAS ELYTIS: OIGE ON. Kalle Kasemaa, Tallinn, Loomingu. Raamatukogu, 1980.

رۆمانیا:

-ODYSSEAS ELYTIS: IAR CA SENTIMENT UN CTISAL. Tr. Victor Ivanovici, Jordan Chimet, Andréas Delyannis, Cluj-Napoca,



Dacia, 1980 et Bucarest.

بەریتانیا:

-ODYSSEAS ELYTIS: THE AXION ESTI. Traslated and annotated by Edmond Keeley and Feorge Savidis, London, Anvil Press POetry, 1980.

ئیسپانیا:

-ODYSSEAS ELYTIS: DIGNUM EST. Version de Cristian Carandell, Barcelona, Plaza y Janes Editores, 1980

هەنگاریا:

-ODYSSZZASZ ELITISZ: A NAPPAL SZULERÉSE. Tr. Papp Arpad, Budapest, Europa Konyvikiados, 1981

ئیتالیا:

-ODISSEO ELITIS: LE OPERA; A cura di Mario Vitti, Roma- Milano; Club degli Editori, 1982.

ڤەنزەوێلا:

-ODYSSEAS ELYTIS: EL AXION ESTI. Vesion de Miguel Castillo Didier; Caracas, 1981.

عەرەبی:

ايليتيس، له المجد (axion esti) ترجمة: شاكر لعيبي. كتاب كلمات، بحرين، ١٩٩٢ .

## پێڕست









PDF 4 KURD